حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

## بۆ پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی

دانانی
لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

بژارکردن و پێداچوونەوەی زانستیی دووەم

صادق احمد عثمان      نەمام جلال رشید      ئەختەر سدیق حسین
سۆزان عەلی محەمەد      موحسین عەلی حسین      حسین صابر علی
شوان غازی پیرداود

چاپی یازدەم      ١٤٣٨ کۆچی      ٢٠١٧ زاینی      ٢٧١٧ کوردی

# پێشەکی

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان لە وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق، لیژنەیەکی بۆ بژارکردن و پێداچوونەوەی زانستی کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) ی قۆناغی نۆیەمی بنەڕەتی پێکهێنا.

لێژنەکە بە شێوەیەکی ورد و زانستیی، پێداچوونەوەی بۆ هەر سێ بەشی (ڕێزمان و ئەدەب و خوێندنەوە) کرد. لە بەشی ڕێزماندا هەوڵدراوە هەڵە ڕێزمانییەکان بەشێوەیەکی زانستیی ورد ڕاستبکرێنەوە.

بە هەمان شێوەش لە بەشی ئەدەبدا، هەڵە زانستییەکان ڕاستکراونەتەوە، لە بەشی نمونەی ئەدەبیشدا ئەگەر شاعیرێک یان نووسەرێک لا برابێت، ئەوە لەبەر ئەوە بووە کە لە قۆناغەکانی داهاتوو هەمان شاعیر یان نووسەر بە فراوانتری دەخوێنرێت لە هەمان بەشیشدا وێنەی شاعیر یان نووسەر دانراوە.

لە بەشی خوێندنەوەدا هەڵەی چاپ و ڕێنووس و زمانەوانی ڕاستکراونەتەوە.

بێگومان لە هەموو کارێک کەم و کوڕی ڕوودەدات، بۆیە داوا لە مامۆستایانی بەڕێز و کەسانی شارەزا دەکەین کە ئەگەر هەڵەیەکیان بەرچاوکەوت، ئەوە لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەروەردەکانیان ئاگادارمان بکەنەوە.

**لێژنەی بژارکردن و پێداچوونەوە زانستی**

**١/ ٢٠١٧**

# بەشی ڕێزمان

## وەرزی یەکەم



## وەرزی دووەم

# وەرزی یەکەم

## ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە

یەکەم:

١- کەوێک لەسەر بەردەکە هەڵنیشتبوو.

٢- پاڵە کاری دەکرد.

٣- ئەڤینیا مەم و زینێ ناڤدارە.

٤- ئازادی دەستێ خۆ هاڤێتە دەستێ کامەرانی .

٥- پیاوەکە پەزی لە مێرگەکەدا دەلەوەڕاند .

٦- لە هەموو هەورێک باران نابارێت .

٧- ئاڤا چەمی کێمە.

دووەم: ( ئـ )

١- کوردستان بە دارستان دەڕازێنینەوە.

٢- ڕەزڤان دوو گوڵدانی هێنا.

٣- جوتیارەکە دەستەکی لە دوو جێگە داناوە.

٤- شەرمین هەندێک سەرینی کڕییە.

٥- زاناو توانا پێکڤە دچنە هاڤینگەها سۆلاڤێ.

٦- نڤیسەرو هۆزانڤان بەرهەمێن خۆ بلاڤ دکەن.

٧- کۆکەو ناڵەی نەخۆشەکە کاری لە ئێمە کرد.

٨- نەرمین حەز لە چاکەو جوانی دەکات.

٩- هاوکارو هاوڕێ دڵسۆزن.

( ب )

١- دۆتماما تە گولاڤێ ژ گوڵەباخێ دروستدکەت.

٢- خویشکا نەوزادی زیرەکە.

٣- هەڤاڵێن مە ژ گردەسۆری چوونە کێوەڕەشێ.

٤-تەمۆ لەبن ڕەشماڵەکە ڕەشمارێکی کوشت.

٥- دڵخواز سەرپۆشی هەیە.

٦- شۆڕەسوارەکە بە خێرایی گەیشت.

٧-ژێرپیاڵەکەم بۆ بهێنە.

## خستنەڕوو

پێشتر زانیومانە، کە ناو وشەیەکە بۆ ناونانی شتێک یان هەر گیانلەبەرێک بەکاردێت. ئێمە لەم وانەیەدا تەماشای ناو دەکەین لە ڕووی پێکهاتنەوە، واتە لەڕووی دروستکردنییەوە، ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی یەکەمی بکەین، دەبینین کۆمەڵێک ناو هەیە بۆ نمونە:

یەکەم:

ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی یەکەم بکەین دەبینین کۆمەڵێک ناو هەن وەک (کەو، بەرد ، پاڵە، کار، ئەڤین، مەم، زین ، ئازاد، دەست، کامەران ، پیاو، پەز، مێرگ ، هەور، باران ، ئاڤ، چەم) هەموویان ناوی سادەن و مەبەستێک پیشاندەدەن و هەریەکەیان لە یەک وشەی واتادار پێکهاتووە.

دووەم:

ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی دووەم (ئـ ) بکەین دەبینین

١- لە ڕستەی یەکەمدا وشەی (کوردستان، دارستان) هەردووکیان ناوی داڕژاون، ماناو مەبەستێک پیشاندەدەن، هەریەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتووە، ناوی (کوردستان) لە ناوی (کورد) لەگەڵ پاشگری (ستان) پێکهاتووە، ناوی (دارستان) لە ناوی (دار)* لەگەڵ پاشگری (ستان) پێکهاتووە، واتە ( ناو + ستان ).

٢- لە ڕستەی دووەمدا وشەی (ڕەزڤان، گوڵدان) هەردووکیان ناوی داڕێژراون واتاو مەبەستێک پیشاندەدەن، لە ڕووی دروستکردنەوە، لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتوون، ناوی (ڕەزڤان) لە ناوی (ڕەز) لەگەڵ پاشگری (ڤان) پێکهاتووە، ناوی (گوڵدان) لە ناوی(گوڵ) لەگەڵ پاشگری (دان) پێکهاتووە، واتە (ناو+ ڤان)، (ناو+دان).

٣- لە ڕستەی سێیەمدا وشەی (جوتیار، دەستەک، جێگە) هەرسێکیان ناوی داڕێژراون و واتاو مەبەستێک پیشاندەدەن، لەڕووی دروستکردنەوە هەریەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتووە، ناوی (جوتیار) لە ناوی (جوت) لەگەڵ پاشگری (یار) پێکهاتووە، ناوی (دەستەک) لە ناوی (دەست) لەگەڵ پاشگری (ەک) پێکهاتووە، ناوی (جێگە) لە ناوی (جێ) لەگەڵ پاشگری (گە) پێکهاتووە، واتە ( ناو+یار)، (ناو+ەک) ، (ناو+ گە).

٤- لە ڕستەی چوارەمدا وشەی (شەرمین، سەرین) ناوی داڕێژراون و ماناو مەبەستێک پیشاندەدەن، هەریەکەیان لە وشەیەکی واتادار

* ئەگەر (دار ، زار ، یار) وەک وشەیەکی سەربەخۆ بەکارنەهاتن دەبن بە پاشگر.

لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتووە، ناوی (شەرمین) لە ناوی (شەرم) لەگەڵ پاشگری (ین) پێکهاتووە، ناوی (سەرین) لە ناوی (سەر) لەگەڵ پاشگری(ین) پێکهاتووە، واتە (ناو+ین).

٥- لەڕستەی پێنجەمدا وشەی (زانا، توانا، هاڤینگە) ناوی دارێژراون و ماناو مەبەستێک پیشاندەدەن، هەریەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتووە، ناوی (زانا) لە ڕەگی کار (زان) لەگەڵ پاشگری (ا) پێکهاتووە، ناوی (توانا) لە ڕەگی کار (توان) لەگەڵ پاشگری (ا) پێکهاتووە، ناوی (هاڤینگە) لە ناوی (هاڤین) لەگەڵ پاشگری (گە) پێکهاتووە، واتە (ڕەگی کار+ ا )، (ناو + گە).

٦- لە ڕستەی شەشەمدا وشەی (نڤیسەر، هۆزانڤان) ناوی دارێژراون، هەریەکەیان واتاو مەبەستێک پیشاندەدەن، لەڕووی دروستکردنەوە هەریەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتووە، ناوی (نڤیسەر) لە ڕەگی کار (نڤیس) لەگەڵ پاشگری (ەر) پێکهاتووە، ناوی (هۆزانڤان) لە ناوی (هۆزان) لەگەڵ پاشگری (ڤان) پێکهاتووە، واتە(ڕەگیکار+ەر)،(ناو+ ڤان)

٧- لە ڕستەی حەوتەمدا وشەی (کۆکە، ناڵە) ناوی دارێژراون و واتاو مەبەستێک پیشاندەدەن، لە ڕووی پێکهاتنەوە هەریەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتووە، ناوی (کۆکە) لە ڕەگی کار (کۆک) لەگەڵ پاشگری(ە) پێکهاتووە، ناوی (ناڵە) لە ڕەگی کار (ناڵ ) لەگەڵ پاشگری (ە) پێکهاتووە واتە(ڕەگیکار+ە)

٨- لە ڕستەی هەشتەمدا وشەی (نەرمین، چاکە، جوانی) ناوی دارێژراون و ماناو مەبەستێک پیشاندەدەن، هەریەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک پێکهاتووە، ناوی (نەرمین) لە هاوەڵناوی

چۆنی (نەرم) لەگەڵ پاشگری (ین) پێکهاتووە، ناوی (چاکە) لە هاوەڵناوی چۆنی (چاک) لەگەڵ پاشگری (ە) پێکهاتووە، ناوی (جوانی) لە هاوەڵناوی چۆنی(جوان) لەگەڵ پاشگری (ی) پێکهاتووە، واتە (هاوەڵناو+پاشگر).

٩- لە ڕستەی نۆیەمدا وشەی (هاوکار، هاوڕێ) ناوی داڕێژراون و واتاو مەبەستێک پیشاندەدەن، لە ڕووی دروستکردنەوە هەریەکەیان لە پێشگری (هاو) لەگەڵ ناوی (کار) پێکاتووە، ناوی هاوڕێ لە پێشگری (هاو) لەگەڵ ناوی (ڕێ) پێکهاتووە، واتا (پێشگر + ناو).

هەروەها لە ڕستەکانی بەشی دووەم (ب) دەبینین:

١- لە ڕستەی یەکەمدا وشەی(دۆتمام، گولاڤ، گوڵەباخ) ناوی (لێکدراون) و واتاو مەبەستێک پیشاندەدەن، لە ڕووی دروستکردنەوە هەریەکەیان بەم شێوەیە پێکهاتووە، ناوی (دۆتمام) لە دوو ناو پێکهاتووە، (ناو+ناو)، (دۆت+مام) ناوی (گولاڤ) لە دوو ناو پێکهاتووە (گوڵ+ئاڤ) واتە(ناو+ناو)، ناوی (گوڵەباخ) لە دوو ناو لەگەڵ ئامرازی لێکدەری (ە)، کە کەوتۆتە نێوانیان پێکهاتووە، (گوڵ+ە+باخ)، (ناو+ە+ناو).

٢- لە ڕستەی دووەمدا وشەی (نەوزاد) ناوێکی لێکدراوە و واتا و مەبەستێک پیشاندەدات، لە هاوەڵناوی (نەو) لەگەڵ ناوی (زاد) پێکهاتووە، واتە (هاوەڵناو + ناو).

٣- لە ڕستەی سێیەمدا وشەی (گردەسۆر، کێوەڕەش )، ناوی (لێکدراون) و واتا و مەبەستێک پیشاندەدەن، ناوی (گردەسۆر) لە ناوی (گرد) لەگەڵ ئامرازی لێکداری (ە) و هاوەڵناوی (سۆر) پێکهاتووە، (ناو+ە+هاوەڵناو) ناوی (کێوەڕەش) لە ناوی (کێو) و ئامرازی لێکداری (ە) و هاوەڵناوی (ڕەش) پێکهاتووە، (ناو+ە+هاوەڵناو).

٤- لـە ڕسـتەی چوارەمدا وشـەی (ڕەشـماڵ، ڕەشـمار) نـاوی لێکدراون واتـاو مەبەسـتێک پیشـاندەدەن، نـاوی (ڕەشـماڵ) لـە هاوەڵنـاوی چۆنـی (ڕەش) لەگـەڵ نـاوی (مـاڵ) پێکهاتـووە، نـاوی (ڕەشـمار) لـە هاوەڵنـاوی چۆنـی (ڕەش) لەگـەڵ ناوی(مـار) پێکهاتـووە، واتە(هاوەڵنـاوی چۆنی+نـاو).

٥- لـە ڕسـتەی پێنجەمـدا وشـەی (دڵخـواز، سـەرپۆش) نـاوی لێکدراون و واتـاو مەبەسـتێک پیشـاندەدەن، نـاوی (دڵخـواز ) لـە نـاوی (دڵ) لەگـەڵ ڕەگـیکار (خـواز) پێکهاتـووە، نـاوی( سـەرپۆش) لـە نـاوی (سـەر) لەگـەڵ ڕەگـیکار (پـۆش) پێکهاتـووە، واتە(نـاو+ ڕەگـیکار).

٦- لە ڕسـتەی شەشـەمدا وشـەی (شـۆڕەسـوار) ناوێکی لێکدراوە و واتاو مەبەسـتێک پیشـاندەدات، لـە هاوەڵنـاوی (شـۆڕ) و ئامـرازی لێکدەری (ە) و نـاوی (سـوار) پێکهاتـووە، (هاوەڵنـاو +ە+نـاو).

٧- لـە ڕسـتەی حەوتەمـدا وشـەی (ژێرپیاڵـە) ناوێکـی لێکدراوەو واتـاو مەبەسـتێک پیشـاندەدات، لـە هاوەڵـکاری (ژێـر ) لەگـەڵ نـاوی (پیاڵـە) پێکهاتـووە، واتـە ( هاوەڵـکار + نـاو ).

## دەستور

ناو لەڕووی پێکهاتنەوە دەکرێت بە دوو جۆر:

یەکەم:

ناوی سادە : ناوێکە لە وشەیەکی واتادار پێکهاتووە واتاو مەبەستێکی دیاریکراوی هەیە وەک ( کەو، بەرد، هەور، دەست...هتد)

دووەم:

ناوی ناسادە: دەکرێت بە دوو جۆر:

ئـ - ناوی دارێژراو: ناوێکە لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێک یان لەگەڵ پێشگرێک پێکهاتووە بەم شێوەیە :

١- ( ناو + پاشگر ) وەک ( کوردستان، گوڵدان، شەرمین، جێگە)

٢- ( ڕەگی‌کار + پاشگر ) وەک (زانا، ناڵە، نقیسەر، فڕگە)

٣- ( هاوەڵناو + پاشگر ) وەک (نەرمین، چاکە، جوانی)

٤- ( پێشگر + ناو ) وەک (هاوکار، هاوژین، هامڕاز)

ب- ناوی لێکدراو : ناوێکە لە دوو وشەی واتادار یا پتر پێکهاتووە، بەم شێوەی خوارەوە:

١- ( ناو + ناو ) وەکو ( دۆتمام ، سۆلاڤ ، ماستاو )

٢- ( ناو + ە + ناو ) وەکو ( گوڵەباغ ، گوڵەگەنم )

٣- ( ناو + ە + هاوڵناو ) وەکو ( گردەسۆر ، کێوەڕەش ، کێڵەشین )

٤- ( هاوڵناو + ناو ) وەکو ( ڕەشماڵ ، ڕەشمار ، سۆرگوڵ ، نەوزاد )

٥- ( ناو + ڕەگی کار ) وەکو ( دڵخواز ، سەرپۆش )

٦- ( هاوەڵکار + ناو ) وەکو ( ژێرپیاڵە ، ژێرزەمین )

* تێبینی:- نیشانەکانی (ناسراوی، نەناسراوی و کۆ) ناوی سادە ناکەن بە ناوی دارژاو.

## ڕاهینانی (١)

بۆ هەریەکێک لەم پاشگرانەی خوارەوە ، دوو ناوی داڕێژراو بهێنە و لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە : ( ایی، ین، ەڵان، گار )

## ڕاهێنان (٢)

پێنج ناوی لێکدراو بهێنە بە مەرجێک سێیان لە هاوەڵکارو ناوێک پێکهاتبێت و یەکێک لە دوو ناو پێکهاتبێت و ئەوی تر لە ناوێک و ڕەگی‌کار پێکهاتبێت .

## ڕاهێنان (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە

١. ناوی (زێڕین) پێکهاتووە لە

(ڕەگی کار+پاشگر / ناو+پاشگر / هاوەڵناو+پاشگر / پێشگر+ناو+پاشگر)

٢. (خێرخواز) پێکهاتووە لە

(هاوەڵناو+ ڕەگی کار / ناو+ڕەگی کار/ ناو+ناو/ هاوەڵناو+ناو+پاشگر)

٣. (خوێنەر) پێکهاتووە لە

(ناو+ڕەگی کار /ڕەگی کار+پاشگر / پێشگر+ناو / هاوەڵکار+پاشگر)

٤. (دڵسۆز) ناوێکی لێکدراوە، پێکهاتووە لە

(هاوەڵناو+ناو / ناو+ ناو / پێشگر+ ناو / ناو+ پاشگر)

٥. (گەڕۆک)

(ڕەگی‌کار+پاشگر/ ناو+پاشگر/ هاوەڵناو+ڕەگی‌کار/ پێشگر+ڕەگی کار+پاشگر)

٦. (قورئانخوێن) پێکهاتووە لە

(ناو+ڕەگی‌کار/ پێشگر+ڕەگی‌کار+پاشگر/ هاوەڵناو+ڕەگی‌کار/ هاوەلکار+ڕەگی‌کار)

٧. (ڕۆژگار) پێکهاتووه له

(ناو+ڕەگی‌کار/ ناو+هاوەلناو/ ناو+پاشگر/ هاوەلکار+پاشگر)

٨. ناوی (نەورۆز) به چ شێوازێک دروستبووه

(هاوەڵناو+ناو/ ناو+ناو/ هاوەڵناو+پاشگر/ هاوەڵناو+هاوەڵناو)

٩. کام لەم ناوانه لێکدراو نییه.

(کوردستان/ گوڵەهێرۆ/ دەستسڕ/ مێرگەسۆر)

## ڕاڤه کردنی پەیڤان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| پاڵه | : | کرێکاری کشتوکاڵی |
| هاڤێته | : | خستییه، دایه |
| دەلەوەڕاند | : | دچەراند |
| بڕازێنەوه | : | بخەملینین |
| سەرین | : | بالیف |
| کۆکه | : | کۆخک |
| دۆتمام | : | کچه مام |
| سەرپۆش | : | دەرسۆک |
| نەو | : | نوێ |
| فرگه | : | فڕۆکەخانه |
| دەستەک | : | جۆگەلەیەک که شینایی تێدا دەچێنرێت |

## چـــــاوگ

ئاشکرایە، کە نەتەوەی کورد زۆر لەمێژە لە تێکۆشانێکی سەختی بەردەوامدایە، بۆ ڕزگارکردنی نیشتمانەکەی لەژێر چەپۆکی داگیرکەراندا، ڕابوونو ڕاپەڕینو شۆڕشی بەرپاکردووە، قوربانیدان لە پێناو ئەم مەبەستە پیرۆزەدا، بە ئەرکێکی ڕەوای زانیوە، هەڵستانەوەی دوای کەوتنی، نیشانەی نەبەردیو زیندوویی بووە، پتەوکردنی ڕیزەکانی گەلو یەکگرتنی هەموو لایەکانو هەڵمەتبردن بۆ سەر دامودەزگەی ڕژێم، لە ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری (١٩٩١)ز سەرکەوتنی بەدەست هێنا، دامەزراندنی پەرلەمانو حکومەتی کوردستان، بەرهەمی خوێنی شەهیدانی گەلی کوردستانە.

پاراستنی ئەم دەستکەوتە مەزنانە ئەرکێکی نیشتمانییەو لەسەر شانی هەموو کوردستانییێکی دڵسۆزە، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی پیرۆزتر، هەر بە ڕێکخستنی ڕیزەکانی گەلو چەسپاندنی یاساو چارەسەرکردنی کێشەکان لە ڕێگەی گفتوگۆو دانیشتن، لەسەر مێزی ئاشتیو گرنگیدان بە خوێندنو فراوانکردنی پرۆسەی دیموکراسی دەبێت.

**خستنەڕوو:**

لەم پارچە نووسینەدا، ئەگەر سەیری پەیڤەکانی (تێکۆشان، ڕزگارکردن، ڕابوون، ڕاپەڕین، قوربانیدان، هەڵستانەوە، کەوتن، پتەوکردن، یەکگرتن، هەڵمەتبردن، ڕاپەڕین، سەرکەوتن، دامەزراندن، پاراستن، چوون، بەدەستهێنان، ڕێکخستن، چەسپاندن، چارەکردن، دانیشتن، گرنگیدان، خوێندن، فراوانکردن) بکەین، دەبینین هەر یەکەیان مانایەکی سەربەخۆی هەیەو هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیدا ڕوودانێک

یا کردەوەیەک دەردەخات، بەڵام نەدراوەتە پاڵ کەسێک یا شتێکو کاتی تێدا نییە، گەردانیش ناکرێت، بەم جۆرە وشانە دەگوترێت (چاوگ). ئەگەر جارێکی تر سەیری ئەم چاوگانە بکەین، دەبینین.

یەکەم:

هەر یەکێک لەم چاوگانە کۆتاییان بە (ان، ین، دن، تن، وون) هاتووە، کە پێیان دەگوترێت (نیشانەی چاوگ) بەم پێیە چاوگ دەکرێت بە پێنج جۆر.

١. چاوگی ئەلفی: ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (ا)یە.
٢. چاوگی یائی: ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (ی)یە.
٣. چاوگی دالی: ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (د)یە.
٤. چاوگی تائی: ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (ت)یە.
٥. چاوگی واوی: ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (وو)ە.

دووەم:

ئـ. بە پیتی (ن)ی کۆتایی چاوگ دەگوترێت (نونی چاوگ)، بۆیە لە زمانی کوردیدا هەموو چاوکێک کۆتایی بە یەکێک لەو نیشانانەی سەرەوە دێت.

ب. هەر یەکێک لەم چاوگانە لە ڕستەدا وەکو ناوێک بەکاردێت.

پ. هەریەکێک لە چاوگانە هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێت.

ت. چاوگ سەرچاوەی داڕشتنی کارە.

ج. هەندێک چاوگ هەن کۆتاییان بە (ەوە) هاتووە، وەک (دۆزینەوە- خولانەوە- حەسانەوە- پاڕانەوە- کولانەوە- ڕشانەوە) ئەمانە چاوگی سادەی واتادارن.

ح. چاوگی دالی لە هەندێک شوێنی کرمانجی سەروو پیتی (د)ی تێدا دەرناکەوێت وەکو (کردن= کرن، مردن= مرن، خواردن= خوارن، بردن=برن).

**دەستور:**

چاوگ وشەیەکە، ڕوودانێک یا کردەوەیەک پیشاندەدات، بەڵام ئەم کردەوەیە نەدراوەتە پاڵ کەسێک یا شتێک، کاتیشی تێدا نییە. لەڕستەدا وەک ناو بەکاردێتو هەموو تایبەتییەکانی ناو وەردەگرێتو ئەرکەکانی ناویش دەبینێت، هەروەها دەبێتە سەرچاوەی دروستکردنی کارو گەلێک وشەی تر.

ئـ. نیشانەکانی چاوگ ئەمانەن: (ان- ین- دن- تن- وون).

ب. بە پیتی (ن)ی کۆتایی چاوگ دەگوترێت (نوونی چاوگ).

## ڕاهێنان (١)

ئەم چاوگانە لەڕستەدا بەکاربهێنە:

دروون، لڤین، هێنان، هەڵبژاردن، سەرکەوتن، چوون، یەکگرتن.

## ڕاهێنان (٢)

نمونەی بە ڕستە بۆ ئەمانە بهێنەوە:

ئـ- دوو چاوگی ئەلفی. ب- دوو چاوگی یائی.

پـ- دوو چاوگی تائی. ج- دوو چاوگی واوی.

چ- دوو چاوگی دالی.

## راهێنان (٣)

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:**

١. لە کرمانجی سەروودا، هەندێک جار ئەم نیشانەی چاوگە دەرناکەوێت.

(چاوگی واوی/ چاوگی ئەلفی/ چاوگی یائی/ چاوگی دالی)

٢. خوێندنەوە چاوگێکی

(ئەلفی/ تائی/ واوی/ دالی)یە

٣. چاوگ وشەیەکە

(گەردانەکرێت/ دەدرێتە پاڵ کەسێک/ هیچیان)

٤. چاوگ:

(سەرچاوەی کارە/ هاوەڵناوە/ هاوەڵکارە/ ئامرازە)

٥. پیتی (ن) لە کۆتایی چاوگ پێیدەوترێت

(جێناوی لکاو/ نونی چاوگ/ ناوبەند/ نیشانەی کۆ)

## راهێنان (٤)

جیاوازی لەنێوان وشەی (ڕۆیشتن) لەم دوو ڕستەیەدا چییە؟ڕوونیبکەوە:

١. ڕۆیشتن جۆرێکە لە وەرزش.

٢. ئەوان ڕۆیشتن بۆ کتێبخانە.

# چــاوگ
# له ڕووی پێکهاتنەوە

یەکەم:

١. کوتانی منداڵان دژی نەخۆشییەکان پێویستە.

٢. ب هاتنا وە ئەم دلشاد بووین.

٣. وڵاتەکەمان بە چاندنی درەخت دەڕازێتەوە.

٤. نرخی دروونی کراسەکە گران بوو.

٥. پشکفتنا بشکۆژێن گوڵان ل بهاران دبیت.

٦. خوێندنم تەواو کردووە.

دووەم:

( ئـ )

١. ڤەکرنا خوێندنگەهان وەلات پێشدکەڤیت.

٢. هەڵبژاردنەکەیان ئەنجامدا.

٣. لە ڕاسپاردنەکەت گەیشتم.

٤. تێگهشتن بناغا زانستێیە.

٥. بە خوێندنەوە زانیاریی نوێ فێردەبین.

٦. قرتاندنی گوڵی باخان جوان نییە.

٧. هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ بۆ ئێمە پێویستە.

(ب)

١. ئاڤدانێت باغچان گەلەک پێدڤییە.

٢. ئێمە بۆ یارمەتیدانی ئێوە هاتووین.

٣. جوانکردنی شارەکان ئەرکێکی نیشتمانییە.

٤. بە گەرمبوون تەنە ڕەقەکان لێکدەکشێن.

٥. دەست پێ کرنا هەر کارەکی پێویستی ب نەخشە دانانێ هەیە.
٦. ڕاستکردنەوەی هەڵەکانم بینی.
٧. ل ناڤبرنا زۆرداریێ ئارمانجا مەیە.
٨. ڕێگەدانی چاپکردنی کتێبەکەم وەرکرت.
٩. بە بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان لایەنەکان، کۆمەڵگە سەقامگیر دەبێت.

## خستنەڕوو:

لە بابەتی پێشوودا ئەوەمان زانی، کە چاوگ ڕوودانێک پیشاندەداتو بەکات نەبەستراوەتەوەو نەدراوەتە پاڵ کەسێک یان شتێک، بەڵام لێرەدا دەمانەوێت بزانین، کە چاوگ لە ڕووی دروستکردنییەوە چۆن پێکدێت؟ کاتێک سەیری ڕستەکان دەکەین، دەبینین چاوگ لە ڕووی دروستکردنییەوە بەم شێوەی خوارەوەییە:

یەکەم: لە ڕستەکانی بەشی (١) پەیڤەکانی (کوتان، هاتن، چاندن، دروون، پشکڤتن، خوێندن) هەموویان چاوگی سادەن، هەر یەکێک لەم چاوگانە ڕوودانێکی پیشانداوەو واتایکی سەربەخۆی هەیە، بەڵام ئەگەر لەڕووی دروستکردنەوە سەیریبکەین، دەبینین هەر یەکێکیان لە یەک وشەی واتادار پێکهاتووە.

دووەم:

( ئـ )

لە ڕستەکانی بەشی (٢)ی بەشی (ئـ)دا وشەکانی (ڤەکرن، هەڵبژاردن، دەرکەوتن، ڕاسپاردن، تێگەیشتن، سەرکەڤتن، خوێندنەوە، قرتاندن، هەڵدانەوە) هەموویان چاوگی دارێژراون، لە ڕووی دروستکردنیانەوە، هەر یەکێک لەم چاوگانە لە چاوگێکی سادە لەگەڵ

پێشگرێک یان پاشگرێک یان لەکەڵ هەردووکیان پێکهاتووە، بەم شێوەی خوارەوە:

١. چاوگی (ڤەکرن) لە پێشگری (ڤە) لەگەڵ چاوگی سادە (کرن) پێکهاتووە.

٢. چاوگی (هەڵبژاردن) لە پێشگری (هەڵ) لەگەڵ چاوگی سادە (بژاردن) پێکهاتووە.

٣. چاوگی (ڕاسپاردن) لە پێشگری (ڕا) لەگەڵ چاوگی سادە (سپاردن) پێکهاتووە.

٤. چاوگی (تێگهێشتن) لە پێشگری (تێ) لەگەڵ چاوگی سادە (گهێشتن) پێکهاتووە.

٥. چاوگی (خوێندنەوە) لە چاوگی سادە (خوێندن) لەگەڵ پاشگری (ەوە) پێکهاتووە.

٦. چاوگی (قرتاندن) لە چاوگی سادە (قرتان) لەگەڵ پاشگری (اندن) پێکهاتووە.

٧. چاوگی (هەڵدانەوە) لە پێشگری (هەڵ)و چاوگی سادە (دان)و پاشگری (ەوە) پێکهاتووە.

( ب )

لە ڕستەکانی بەشی (٢) ی بەشی (ب) دا پەیڤەکانی (ئاڤدان، یارمەتیدان، جوانکردن، گەرمبوون، دەستپێکردن، ڕاستکردنەوە، ل ناڤبردن، ڕێگەدان، بەهێزکردن) هەموویان چاوگی لێکدراون لە ڕووی دروست کردنیانەوە هەر یەکێکیان لە دوو وشەی واتادار یا پتر پێکهاتووە.

١. چاوگی (ئاڤدان) له ناوی (ئاڤ ) لەگەڵ چاوگی ساده (دان) پێکهاتووه.
٢. چاوگی (یارمەتیدان) لەناوی (یارمەتی) لەگەڵ چاوگی ساده (دان) پێکهاتووه.
٣. چاوگی (جوانکردن) له هاوەڵناوی (جوان) لەگەڵ چاوگی ساده (کردن) پێکهاتووه.
٤. چاوگی (گەرمبوون) له هاوەڵناوی (گەرم) لەگەڵ چاوگی ساده (بوون) پێکهاتووه.
٥. چاوگی (دەستپێکرن) له ناوی (دەست) لەگەڵ چاوگی دارێژراوی (پێکرن) پێکهاتووه.
٦. چاوگی (ڕاستکردنەوە) له هاوەڵناوی (ڕاست) لەگەڵ چاوگی دارێژراوی (کردنەوە) پێکهاتووه.
٧. چاوگی (ل ناڤبرن) له هاوەڵکاری دارێژراوی (ل ناڤ ) لەگەڵ چاوگی ساده (برن) پێکهاتووه.
٨. چاوگی (ڕێگەدان) له ناوی دارێژراوی (ڕێگە) لەگەڵ چاوگی سادەی(دان)پێکهاتووه.
٩. چاوگی (بەهێزکردن) له هاوەڵناوی دارێژراوی (بەهێز) لەگەڵ چاوگی ساده (کردن) پێکهاتووه.

**دەستور:**

چاوگ لەڕووی پێکهاتنەوه دوو جۆره:

١. چاوگی ساده:

ئەو چاوگەیە، که تەنیا له یەک وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکهاتووه.
وەک: نووسین، خوێندن، نووستن، کێڵان، بوون، کردن

### ٢. چاوگی ناسادە: دوو جۆرە.

#### ئ- چاوگی دارێژراو:

ئەو چاوگەیە کە لە چاوگێکی سادە لەگەڵ پێشگرێک یان پاشگرێک یان لەگەڵ هەردووکیان پێکهاتووە:

١- (پێشگر+ چاوگی سادە) وەک: هەڵبوون، ڕاکردن، بەرکەوتن، لێدان.

٢- (چاوگی سادە+ پاشگر) وەک: خواردنەوە، خوێندنەوە، برژاندن، کولاندن.

٣- (پێشگر+ چاوگی سادە+ پاشگر) وەک: هەڵبوونەوە، ڕاکردنەوە، لێدانەوە.

پێشگرەکان ئەمانەن: (هەڵ، دا، ڕا، پێ، تێ، دەر، بەر، ڤە، لێ).

پاشگرەکان ئەمانەن: (ەوە، اندن)

#### ب- چاوگی لێکدراو:

لە چاوگێکی سادە یان دارێژراو لەگەڵ وشەیەکی واتاداری تر یان پتر پێکهاتووە. بەم شێوەیە:

١- (ناو + چاوگی سادە) وەک: یارمەتیدان، دەستگرتن.

٢- (هاوەڵناوی چۆنی+ چاوگی سادە) وەک: گەورەکردن، گەرمبوون، بڵندکردن، جێگیرکردن.

٣- (ناو+ چاوگی دارێژراو) وەک: دەست هەڵگرتن، سەرهەڵبڕین.

٤- (هاوەڵناوی چۆنی+ چاوگی دارێژراو) وەک: ڕاستکردنەوە، چاکبوونەوە.

٥- (ناوی دارێژراو+ چاوگی سادە) وەک: بەخێوکردن.

٦- (هاوەڵناوی دارێژراو+ چاوگی سادە) وەک: بەهێزکردن، بەئاگاهاتن.

٧- (هاوەڵکاری دارێژراو+ چاوگی سادە) وەک: ل ناڤچوون، لەناوبردن.

## ڕاهێنان (١)

لەم چاوگە سادانەی خوارەوە چاوگی داڕێژراو و لێکدراو دروستبکە:

(چوون، کێشان، گرتن، خواردن، بڕین، هێنان)

## ڕاهێنان (٢)

جیاوازی لە نێوان چاوگی داڕێژراو و لێکدراو چییە لە ڕووی دروستکردنەوە؟ بە نموونە ڕوونیبکەوە.

## ڕاهێنان (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. (برژاندن): چاوگێکی (سادەیە/ داڕێژراوە/ لێکدراوە/ هیچیان)

٢. (ڕێزگرتن): پێکهاتووە لە

(ناو+چاوگی سادە / هاوەڵناو+چاوگی سادە /
هاوەڵکار+چاوگی سادە / چاوگی سادە+ناو)

٣. (گەرمبوون): پێکهاتووە لە

(هاوەڵناو+پاشگر/ هاوەڵناو+چاوگی سادە/ ناو+ڕەگیکار/هاوەڵناو+ناو)

٤. (لێنان): پێکهاتووە لە

(پێشگر+چاوگی سادە/ ناو+چاوگی سادە/
پێشگر+چاوگی داڕێژراو/ چاوگی سادە+پاشگر)

٥. (ڕاپەڕین): پێکهاتووە لە

(پێشگر+ناو/ ناو+ڕەگیکار/ هاوەڵکار+پاشگر/ پێشگر+چاوگی سادە)

٦. کام لەم چاوگانە لە (پێشگر+چاوگی سادە+پاشگر) دروستبووە،

(داشکاندن/ ڕاپەڕین/ سەرکەوتن/ کردنەوە)

# بەکارهێنانی چاوگ وەک ناو

ئـ/

١. نووسینەکەم هێناوە.

٢. نووسینەکانم کۆکردەوە.

٣. ئاخافتنا باش دلێ مرۆڤی خۆش دکەت.

٤. نووسینی هێمنم خوێندوەتەوە.

٥. هاتنا وان بۆ کارگەهێ گەلەک باش بوو.

ب/

١. نڤستن بۆ نەخۆشی دەرمانە.

٢. سوتان بە ئازارە.

٣. خوێندن کۆمەڵ پێشدەخات.

٤. خۆزی کوشتن ل وەلاتێ مە نەمابا.

٥. خوێندنم تەواوکردووە.

٦. مە خوارن کڕییە.

٧. هەر بە تێکۆشان دەگەینە ئامانج.

٨. کوردستان هەر ب زانینێ پێش دکەڤیت.

٩. بەرهەمی ڕاپەڕین دیارە.

١٠. کاری قوتابی خوێندنە.

١١. هەڵبژاردنەکە ئەنجامدرا.

**خستنەڕوو:**

لەمەوبەر بۆمان ئاشکرابوو، کە چاوگ وەکو ناوێک لەناو ڕستەدا بەکاردێت، چونکە تایبەتییەکانی ناو وەردەگرێتو هەموو ئەرکەکانی ناو لەڕستەدا دەبینێت.

ئـ- تایبەتییەکانی ناو وەردەگرێت کە ئەمانەن: چاوگ وەکو ناو دەتوانرێت بکرێت بە ناسراو بە هۆی نیشانەی ناسراو (ەکە). هەروەها دەتوانرێت بکرێت بە کۆی ناسراو بەهۆی نیشانەی کۆ (ان) کە دەخرێتە دوای نیشانەی ناسراوی (ەکە). هەروەها دەتوانرێت تەواو بکرێت بە (ناو، جێناو، هاوەڵناوی چۆنی). بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستییانە ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین دەبینین:

١. لەڕستەی یەکەمدا وشەی (نووسینەکە) چاوگێکی ناسراوە بەهۆی نیشانەی ناسراوی (ەکە) بووە بە ناسراو.

٢. لە ڕستەی دووەمدا وشەی (نووسینەکان) چاوگێکی کۆی ناسراوە بەهۆی نیشانەی کۆ (ان) کە خراوەتە دوای نیشانەی ناسراوی (ەکە).

٣. لەڕستەی سێیەمدا وشەی (ئاخافتن) چاوگەو بە هاوەڵناوی چۆنی (باش)، دیارخراوە.

٤. لەڕستەی چوارەمدا وشەی (نووسین) چاوگەو بە ناوی (هێمن) دیارخراوە.

٥. لەڕستەی پێنجەمدا وشەی (هاتن) چاوگەو بە جێناوی کەسیی سەربەخۆ (وان) دیارخراوە.

ب- چاوگ ئەرکەکانی ناو دەبینێت لە ڕستەدا، ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین، دەبینین هەر چاوگێک ئەرکێکی بینیوە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

لەڕستەی یەکەمو دووەمدا چاوگی (نقستن، سووتان) هەر یەکەیان نیهادە لە ڕستەی خۆیاندا، چونکە هەواڵێک یان سیفەتێک دراوەتە پاڵ هەر یەکێکیان، لەڕستەی سێیەمو چوارەمدا چاوگی (خوێندن، کوشتن) بکەرن، چونکە هەر یەکەیان کارێکی دراوەتە پاڵ.

لەڕستەی پێنجەمو شەشەمدا چاوگی (خوێندن، خوارن) بەرکارن، چونکە هەر یەکەیان مانای کاری تەواو کردووەو کاریگەرێتی کاریشی کەوتۆتە سەر.

لە ڕستەی حەوتەمو هەشتەمدا چاوگی (تێکۆشان، زانین) تەواوکەری بە یاریدەن.

لە ڕستەی نۆیەمدا چاوگی (ڕاپەڕین) ئەرکی دیارخەری ناوی (بەرهەم) ی بینیوە.

لە ڕستەی دەیەمدا چاوگی خوێندن ئەرکی تەواوکردنی کاری ناتەواوی (ە)ی بینیوە.

لە ڕستەی یازدەمدا چاوگی (هەڵبژاردن) ئەرکی جێگری بکەری بینیوە.

لە ئەنجامدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە چاوگ تایبەتییەکانو ئەرکەکانی ناو لەڕستەدا وەردەگرێتو جێ بەجێی دەکات، لەبەر ئەوە چاوگ وەک ناوە.

دەستور:

چاوگ لە ڕستەدا وەک ناوێک بەکاردێت، چونکە:

ئـ-

تایبەتییەکانی ناو وەردەگرێت، دەتوانرێت بکرێت بە (تاکی ناسراو، کۆی ناسراو، دیارخراو بێت بەناو یان بەجێناو یان بە هاوەڵناوی چۆنی).

ب-

ئەرکەکانی ناو دەبینێت، دەبێت بە (نیهاد، بکەر، بەرکار، تەواوکەری بەیاریدە، دیارخەری ناو، تەواوکەری کاری ناتەواو، جێگری بکەر) لەڕستەدا.

## ڕاهێنان (١)

وەڵامی ڕاست بۆ وشە هێڵ بەژێرهاتووەکان هەڵبژێرە.

١. بژارکردن بۆ کشتوکاڵ بە سودە.

(نیهاد/ بکەر/ تەواوکەری بەیاریدە/ بەرکار)

٢. هێنان بردنەوەی دەوێت.

(بکەر/ بەرکار/ دیارخەر/ نیهاد)

٣. ب ئاڤاکرنا گوندان ژێر خانا ئابوری ڤەدژیتەوە.

(بەرکار/ تەواوکەریکاریناتەواو/ تەواوکەریبەیاریدە/ جێگری بکەر)

٤. بریا خوێندنم تەواو کردبایە.

(بکەر/ بەرکار/ دیارخەر/ تەواوکەری بەیاریدە)

٥. کارگەی چنین کوتاڵ دروستدەکات.

(بەرکار/ دیارخەر/ دیارخراو/ نیهاد)

٦. ئەڤە کەنگی نڤیسینە؟

(نیهاد/ تەواوکەری کاری ناتەواو/ بەرکار/ بکەر)

## ڕاهێنان (٢)

چاوگی (یارمەتیدان) لەڕستەدا بەکاربهێنە بەمەرجێک هەموو ئەرکەکان ببینێت.

## ڕاهێنان (٣)

لەڕستەی (ڕاپەڕین ئێمەی گەیاندە سەرکەوتن)

١- وشەی (ڕاپەڕین) چییە؟ چۆن دروست کراوە؟ ئەرکی چییە؟

٢- وشەی (ئێمە) شی بکەوە.

٣- وشەی (سەرکەوتن) چییە؟ چ جۆرێکە؟ ئەرکی چییە؟

٤- (ی) لە دوای وشەی (ئێمە) چییە؟ ئەرکی چییە؟

٥- وشەی (ڕاپەڕین) لە ڕستەیەکی تردا ببێتە بەرکار.

٦- وشەی (سەرکەوتن) بکە بە کۆی ناسراوو لەڕستەیەکی تردا ببێتە نیهاد.

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١. ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان ڕاگەیاند.

٢. خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە.

# ڕەگـــــی کار

(١)

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| کێڵان | کێڵا | کێڵ |
| کوتان | کوتا | کوت |
| پیڤان | پیڤا | پیڤ |
| کڕین | کڕی | کڕ |
| مردن | مرد | مر |
| خوێندن | خوێند | خوێن |
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤ |
| گرتن | گرت | گر |
| دانیشتن | دانیشت | دانیش |
| چوون | چوو | چ |
| بوون | بوو | ب |

**خستنەڕوو:**

ئـ . پێشـتر زانیمـان، کـە چـاوگ کردەوەیـەک پیشـاندەدات و کردەوەکـە نادرێتـە پـاڵ کەسـێک یـا شـتێک، هەروەهـا کاتـی تێدانییـە، چاوگـەکان بـە پیتـی پێش (ن)ی چـاوگ دەناسـرێنو دەکرێـن بـە پێنـج جـۆر لـە رووی نیشـانەوە چاوگـی (ئەلفـی، یائـی، دالـی، تائـی، واوی)*. واتـە چـاوگ بـە یەکێـک لـەم نیشـانانە (ان، یـن، دن، تـن، وون) کۆتایـی دێتو بـە هـەر یەکێکیـان دەوترێت نیشـانەی چـاوگ. بـە پیتـی (ن)ە کـەش دەگوترێت (نوونـی چـاوگ) وەکـو لـە سـتوونی یەکەمـدا خراوەتـە ڕوو.

(کێڵان، کوتان، پیڤان، کڕین، مردن، خوێندن، ڕەڤین، گرتن، دانیشتن، چوون، بوون).

ب. ئەگەر سەیری وشەکانی ستوونی دووەم بکەین (کێڵا، کوتا، پیڤا، کڕی، مرد، خوێند، ڕەڤی، گرت، دانیشت، چوو، بوو). دەبینین هەموویان لە چاوگەکانی ستوونی یەکەم وەرگیراون، بە لابردنی نونی چاوگ دروستکراون، بە ئەمانە دەگوترێت (قەد) یان (کاری ڕابردووی نزیک)، کە دەبێتە بنچینەی دروستکردنی هەموو جۆرەکانی تری کاری ڕابردوو، کە لەمەودوا دەیان خوێنین.

پ. ئەگەر سەیری وشەکانی ستوونی سێیەم بکەین (کێڵ، کوت، پیڤ، کڕ، مر، خوێن، ڕەڤ ، گر، دانیش، چـ ، ب) دەبینین هەموویان لە چاوگەکانی ستوونی یەکەم وەرگیراون‌و پێیان دەگوترێت (ڕەگی کار) ، بەشی هەرە زۆری (ڕەگی کار) بە تەنیا بەکار نایەت‌و مانای تەواو نابەخشێت، بەڵام دەبێتە سەرچاوە بۆ دروستکردنی کاری (ڕانەبردوو، داخوازی)و گەلێک وشەی تر.

## دەستور:

ئـ : ڕەگی کار: ئـەو بەشـەیە، کـە لـە چـاوگ وەردەگیرێتو واتـای چـاوگ هەڵدەگرێت و بەشـی هـەرە زۆری ڕەگـی کار بـە تەنیـا بـەکار نایـەتو واتـای تـەواو نابەخشـێت، بـەڵام دەبێتـە سـەرچاوە بـۆ دروسـتکردنی کاری (ڕانەبـردوو، داخـوازی)و گەلێـک وشـەی تـر لـە زمانەکەمـان.

ب: بۆ دۆزینـەوەی رەگی کار کارەکە دەکەینە رانەبردوو دوای لابردنی (دە، جێناوی لکاو) ئەوەی دەمێنێتەوە پێیدەگوترێت رەگی کار
نووسین ⟵ دەنووسم ( دە + نووس + م )

# دۆزینەوەی ڕەگی کار

(٢)

| | چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|---|
| ئـ- | هێنان | هێنا | هێن |
| | پیڤان | پیڤا | پیڤ |
| | کێڵان | کێڵا | کێڵ |
| | شێلان | شێلا | شێل |
| | کێشان | کێشا | کێش |
| ب- | خنکان | خنکا | خنکێ |
| | برژان | برژا | برژێ |
| | زان | زا | زێ |
| | شکان | شکا | شکێ |
| | دڕان | دڕا | دڕێ |

**خستنه ڕوو:**

ئـ- کاتێک سەیری چاوگەکانی بەشی (ئـ) دەکەین (هێنان، پیڤان، کێڵان، شێلان، کێشان) دەبینین هەموو چاوگی تێپەڕی (ئەلفی) ن، ڕەگی کار لەم چاوگانە بە لابردنی نیشانەی چاوگ (ان) دروست دەکرێت، ئەوەی دەمێنێتەوە پێی دەگوترێت ڕەگی کار وەکو (هێن، پیڤ، کێڵ، شێل، کێش).

ب- کاتێک سەیری چاوگەکانی بەشی (ب) دەکەین (خنکان، برژان، زان، شکان، دڕان) دەبینین هەموویان چاوگی تێنەپەڕی (ئەلفی) ن،

ڕەگی کار لەم چاوگانە دروست دەکرێت بە لابردنی (ن)ی چاوگو گۆڕینی پیتی (ا) بۆ پیتی (ێ) وەکو (خنکێ، برژێ، زێ، شکێ، درێ).

تێبینی: چاوگی (لێنان) چاوگێکی ئەلفی تێپەڕە، ڕەگی کاری لێ دروست دەکرێت بە ڕێگای چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ بەڵام ڕەگی کار لە چاوگی (شیان، گریان، ژیان) لەم دەستورە لادەدەن، ڕەگی کار لە چاوگی (شیان- شێ) (گریان- گری) (ژیان- ژی) هەروەها ڕەگی کار لە چاوگی (مان) دەبێتە (مێن) ئەمەش لە دەستور لایداوە. ڕەگی چاوگی (دان) بریتییە لە (دە) بە هەمان شێوە لە دەستور لایداوە.

**دەستور:**

دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگە ئەلفییەکان بەم شێوەیە دەبێت:

ئـ -

ئەگەر چاوگی ئەلفی تێپەڕ بوو، ڕەگی کار دروست دەکرێت، تەنها بە لابردنی نیشانەی چاوگ (ان) ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگی کارە.

ب-

ئەگەر چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ بوو، ڕەگی کار دروست دەکرێت بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگو گۆڕینی پیتی (ا) بۆ (ێ).

## دۆزینەوەی ڕەگی کار

(٣)

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| بڕین | بڕی | بڕ |
| نڤیسین | نڤیسی | نڤیس |
| کڕین | کڕی | کڕ |
| بەخشین | بەخشی | بەخش |
| زانین | زانی | زان |
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤ |
| فڕین | فڕی | فڕ |
| لەرزین | لەرزی | لەرز |
| زڤڕین | زڤڕی | زڤڕ |

**خستنەڕوو:**

ئەگەر سەیری چاوگەکان بکەین (بڕین، نڤیسین، کڕین، بەخشین، زانین، ڕەڤین، فڕین، لەرزین، زڤڕین) دەبینین هەموویان چاوگی یائین، هەندێکیان، تێنەپەڕن وەک: (ڕەڤین، فڕین، لەرزین، زڤڕێن) ڕەگی کار لە چاوگی (تێپەڕو تێنەپەڕ) دروستدەکرێت ئەویش بە لابردنی نیشانەی چاوگ (ین).

**دەستور:**

دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگی یائی لە تێپەڕو تێنەپەڕ بە لابردنی نیشانەی چاوگ (ین) دەبێت.

## دۆزینەوەی ڕەگی کار

(٤)

| | چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|---|
| ئـ- | چوون | چوو | چـ |
| | بوون | بوو | ب |
| ب- | دروون | درووو | درووو |
| | گرووون | گرووو | گرووو |
| | جوون | جوو | جوو |
| | سوون | سوو | سوو |

**خستنەڕوو:**

ئـ -

کاتێک سەیری چاوگەکانی بەشی (ئـ) دەکەین (چوون ، بوون) دەبینین چاوگی (واو)ی تێنەپەڕن، ڕەگی کار لەم چاوگانە بە لابردنی نیشانەی چاوگ دروستدەکرێت، واتە لابردنی (وون)و ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگی کارە وەک (چـ ، ب).

ب-

کاتێک سەیری چاوگەکانی بەشی (ب) دەکەین (درووون، گرووون، جوون، سوون) دەبینین ئەمانەش چاوگی (واوی)ن‌و تێپەڕن ڕەگی کار لەم چاوگانە تەنها بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ دروستدەکرێت وەک: (درووو، گرووو، جوو، سوو). لێرەدا ڕەگی کار لەگەڵ قەدی چاوگ لە ڕووی دروستکردنەوە وەک یەکن.

**دەستور:**

دۆزینەوەی ڕەگی کار لەچاوگی واوی بەم شێوەیەیە:

ئـ-

لە چاوگی واوی تێنەپەڕدا ڕەگی کار دروستدەکرێت بە لابردنی نیشانەی چاوگ کە (وون)ە.

ب-

لە چاوگی واوی تێپەڕدا ڕەگی کار دروستدەکرێت تەنها بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ. واتا (ڕەگ و قەد) وەک یەکن.

# دۆزینەوەی ڕەگی کار

(٥)

ئ/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| فرۆشتن | فرۆشت | فرۆش |
| ڕێستن | ڕێست | ڕێس |
| کەفتن | کەفت | کەڤ |
| گرتن | گرت | گر |
| خوێندن | خوێند | خوێن |
| مردن | مرد | مر |
| لێبووردن | لێبوورد | لێبوور |

ب/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| سپاردن | سپارد | سپێر |
| چاندن | چاند | چێن |
| ناردن | نارد | نێر |
| سەندن | سەند | سێن |
| برژاندن | برژاند | برژێن |
| ستاندن | ستاند | ستێن |
| پاڵاوتن | پاڵاوت | پاڵێو |
| ڤەشارتن | ڤەشارت | ڤەشێر |

پ/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| خواستن | خواست | خواز |
| گەستن | گەست | گەز |
| پاراستن | پاراست | پارێز |
| کوشتن | کوشت | کوژ |
| هاڤێشتن | هاڤێشت | هاڤێژ |
| چێشتن | چێشت | چێژ |
| ڕێشتن | ڕێشت | ڕێژ |

ت/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| نووستن | نووست | نوو |
| ڕۆیشتن | ڕۆیشت | ڕۆ |
| خواردن | خوارد | خۆ |
| شووشتن | شووشت | شۆ |
| خستن | خست | خە |
| هاتن | هات | هێ(ێ) |
| بردن | برد | بە |
| کردن | کرد | کە |
| هێشتن | هێشت | هێڵ |
| ویستن | ویست | ەوێ |
| گۆتن | گۆت | ڵێ |

## خستنەڕوو:

دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگی (تائی یان دالی) بە چەند شێوەیەکی جیاواز دەبێت:

ئـ - شێوەی یەکەمیان لە هەندێک چاوگی (تائی یا دالی) وەک نمونەکانی بەشی (ئـ) کە چاوگەکان (فرۆشتن، ڕێستن، کەڤتن، گرتن، خوێندن، مردن، لێبووردن) هەندێکیان تێپەڕن، هەندێکیان تێنەپەڕن، ڕەگی کار لەم چاوگانەدا یەکسەر بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن یان دن) دروستدەکرێت، بەڵام ژمارەی ئەم بەشەیان کەمە.

ب- شێوەی دووەمیان لە هەندێک چاوگی (تائی یان دالی) وەک نمونەکانی بەشی (ب) چاوگەکان (سپاردن، چاندن، ناردن، سەندن، برژاندن، ستاندن، پالاوتن، ڤەشارتن) دۆزینەوەی ڕەگی کاری ئەو چاوگانەی، کە پیتی پێش پیتە نەبزوێنەکەی پێش نیشانەی چاوگ پیتی بزوێنی (ا، ە) بوو، ڕەگی کار بەم شێوەیە دروستدەکرێت، نیشانەی چاوگ (تن، یان دن) لادەبرێن، پیتی بزوێنی (ا، ە) کە لەپێش پیتە نەبزوێنەکەیە دەگۆڕێت بۆ پیتی بزوێنی (ێ) وەک (سپێر، چێن، نێر، سێن، برژێن، ستێن، پالێو، ڤەشێر).

پ- شێوەی سێیەم لە هەندێک چاوگی تائیدا وەک نمونەکانی بەشی (پ) چاوگەکان (خواستن، گەستن، پاراستن، کوشتن، هاڤێشتن، ڕێشتن، چێشتن) دۆزینەوەی ڕەگی کار لەم چاوگانەی، کە پیتی پێش نیشانەی چاوگ (تن) (س، ش) بوو، بەم شێوەیە دەبێت، نیشانەی چاوگ (تن)

لا دەبرێت ئینجا پیتی (س) دەگۆڕێت بۆ پیتی (ز)، پیتی (ش) دەگۆڕێت بۆ پیتی (ژ) وەکو (خواز، پارێز، کوژ، هاڤێژ، ڕێژ، چێژ).

ت - شێوەی چوارەم لە هەندێک چاوگی تائی یان دالی وەک نمونەکانی بەشی (ت)، چاوگەکان (گەیشتن، نووستن، خواردن، شووشتن، خستن، ڕۆیشتن، بردن، کردن، هێشتن، ویستن، گۆتن) دۆزینەوەی ڕەگی کار لەو چاوگانە دەستورێکی تایبەتی نییە، بەڵکو دەبێت لەبەربکرێن، ژمارەی ئەم چاوگانە کەمە وەک ڕەگەکانی (گە، نوو، خۆ، شۆ، خە، ڕۆ، بە، کە، هێڵ، وێ، لێ، بێژ).
جگە لەو شێوانەی، کە باسمانکردن چاوگی تائی هەیە ڕەگی کاری لێدروستدەکرێت تەنها بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ وەک:

| چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|
| بیستن | بیست |
| بەستن | بەست |
| پەرستن | پەرست |

**دەستور:**

دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگی تائیو دالی بەم شێوەیە وەردەگیرێت:

ئـ - لە بەشێکی چاوگی تائی یان دالی ڕەگی کار بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن، دن) وەردەگیرێت.

ب - لە بەشێکی تری چاوگی تائی یان دالی بە تایبەتی لەو چاوگانەی، کە پیتی پێش پیتە نەبزوێنەکەی پێش نیشانەی چاوگ( ا، ە)یە، ڕەگی کار بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن، دن) لەگەڵ گۆڕینی پیتی (ا، ە) بۆ پیتی (ێ) وەردەگیرێت.

پ- لە بەشێکی تری چاوگی (تائی) دا بەتایبەتی لە هەندێک لەو چاوگانەی، کە پیتی پێش نیشانەی چاوگ (س، ش)ە ڕەگی کار بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن) لەگەڵ گۆڕینی پیتی (س) بۆ پیتی (ز)، و پیتی (ش) بۆ پیتی (ژ) وەردەگیرێت.

ت - لە بەشێکی تری چاوگی تائیو دالی ڕەگی کار بەبێ دەستور وەردەگیرێت، لەبەرئەوە دەبێت لەبەربکرێن، بەڵام ژمارەیان کەمە. چاوگی تائی هەیە ڕەگی کاری تەنها بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ لێوەردەگیرێت.

## ڕاهێنان (١)

لەم چاوگانەی خوارەوە ڕەگی کار وەربگرە و چۆنیەتی وەرگرتنەکەی دیاربکە:

(پسان، ژیان، سووان، گریان، سوون، لێنان، ڕاپەڕاندن، مانەوە، بارین).

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕەگی کارانە لە چ چاوگێک دروستکراون‌و چۆن؟

(مێن، وێ، بە، ڕۆ، کوژ، پارێز)

## ڕاهێنان (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. ئەگەر ڕەگی کار لە چاوگی واوی تێپەڕ وەربگرین، ئەو پیتە لادەدەین .......... (واو و نون/ واو/ نون)

٢. ئەگەر ڕەگی کار لە چاوگی واوی تێنەپەڕ وەربگرین، ئەو پیتە لادەدەین .......... (واو و نون/ واو/ نون)

٣. ئەگەر ڕەگی کار لە چاوگی ئەلفی تێپەڕ وەربگرین، بە لابردنی پیتی...... (ئەلف و نون/ ئەلف/ نون)

٤. ڕەگی کاری (ڕێژ و چێژ) وەرگیراوە لە چاوگی.........

(ڕێسین/ ڕێشتن وچێشتن/ ڕێشتن و ڕێسین)

٥. ڕەگی کاری (بێژ و مێن) وەرگیراوە لە چاوگی ......

(گوتن و مان/ بێشتن و مان/ بێشتن و گوتن)

## ڕاهێنان (٤)

بەنمونە وەڵامی ئەمانە بدەوە:

ئـ- چۆن ڕەگی کار لە چاوگی واوی تێنەپەڕ دروست دەکرێت؟

ب- چۆن ڕەگی کار لە چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ دروست دەکرێت؟

پ- کەی پیتی (س) دەگۆڕێت بۆ (ز) و پیتی (ش) دەگۆڕێت بۆ (ژ) لە دروستکردنی ڕەگی کاردا؟

ت- کەی پیتی (ا،ە) دەگۆڕێت بۆ (ێ) لەکاتی دروست کردنی ڕەگی کاردا؟

## چاوگ سەرچاوەی دروستکردنی کارە

ئـ/

١. خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە.

٢. نڤیسین بۆ مە پێویستە.

٣. زانین ڕوناکییە.

٤. ئەم هەر ب یەکگرتنێ دگەهینە ئارمانجێ.

٥. ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان ئەرکێکی کوردایەتییە.

٦. پاراستنی دەستکەوتەکان نیشانەی دڵسۆزییە.

ب/

١. ئەوان وانەکە دەخوێنن.

٢. ئازاد چیرۆکێ نڤیسی.

٣. ئێمە پرسیارەکەمان زانی.

٤. کۆمەڵەکان یەکیانگرت.

٥. گوندەکان ئاوەدانبکەنەوە.

٦. دارستانەکان دەپارێزین.

### خستنەڕوو:

ئـ - کاتێک سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین وشەکانی (خوێندن، نڤیسین، زانین، یەکگرتن، ئاوەدانکردنەوە، پاراستن) هەموویان (چاوگن)و وەک ناو لەڕستەدا بەکارهێنراون، هەر یەکێک لەم چاوگانە کردەوەیەک پیشاندەدات، بەڵام کردەوەکە نەدراوەتە پاڵ کەسێک یان شتێک، هەروەها کاتی دیاریکراوی تێدانییە.

ب- کاتێک سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) دەکەین، دەبینین وشەی (دەخوێنین، نقیسی، زانی، یەکیانگرت، ئاوەدانبکەنەوە، دەپارێزین) هەموویان لێرەدا (کارن)و لە چاوگەکانی بەشی (ئـ) وەرگیراونو لێیان نزیکن، هەر یەکێک لەم کارانە، کردەوەیەکی پیشانداوەو خراوەتە پاڵ کەسێک، یان شتێک کە بکەرەکەیەتی لە کاتێکی دیاریکراودا، بۆکاتی ڕابردوو یان ڕانەبردوو.

ئەگەر جارێکی تر بە وردی سەیری کارەکان بکەین لە ڕووی دروستکردنیانەوە، دەبینین هەر یەکێک لەم کارانە لە چاوگێک وەرگیراوە، یان دروستکراوە کە لەڕستەکانی بەشی (ئـ) هاتوون، ئەمەش بە لابردنی پیتی (ن)ی نیشانەی چاوگ، کەواتە دەتوانرێت کاری ڕابردوو لە چاوگ دروستبکرێت، بۆیە چاوگ بە سەرچاوەو بناغەی دارشتنی کار دادەنرێت.

**دەستور:**

چاوگ سەرچاوەی دارشتنی کارە، چونکە دەتوانرێت کاری (ڕابردوو، ڕانەبردوو، داخوازی) لێدروستبکرێت هەر کارێک دەبێت ئەم سێ شتە بگەیەنێت:

١. کردەوەیەک پیشانبدات.
٢. کردەوەکە بخرێتە پاڵ کەسێک یان شتێک، کە بکەرەکەیەتی.
٣. کاتێکی دیاریکراوی تێدا هەبێت.

## ڕاهێنان (١)

سێ چاوگ بهێنەوە، ئینجا کاری ڕابردوویان لێ دروستبکە و جارێک وەک چاوگ و جارێک وەک کار لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە.

## ڕاهێنان (٢)

جیاوازی لەنێوان چاوگو کاردا چییە؟ بە نمونە ڕوونیبکەوە.

## ڕاهێنان (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. چاوگ سەرچاوەی داڕشتنی ..... (کارە/ ناوە/ جێناوە)

٢. خاسیەتی چاوگ بریتییە لەوەی کە.....

(کاتی دیاریکراوی تێدایە/ ئەرکی ناو نابینێ/ ناخرێتە پاڵ کەسێک)

٣. خاسیەتی کار بریتییە لەوەی کە......

(کاتی تێدانییە/ ئەرکی ناو دەبینێ/ دەخرێتە پاڵ کەسێک)

٤. (مە خوێندن تەواو کر) خوێندن ئەرکی.....

(بکەرە/ بەرکارە/ دیارخەری ناوە)

٥. (نووسینەکانی ئێوەم خوێندەوە) نووسینەکان.....

(دیارخراوە/ نیهادە/ دیارخەری ناوە)

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١- مە خوێندن تەواو کر.

٢- ژووری دانیشتنەکەیان پاککردەوە.

٣- نووسینەکانی ئێوە دەخوێنمەوە.

## دەمەکانی کاری ڕابردوو

١. دیار چوو بۆ قوتابخانە.

٢. تابلۆیەکەم بینیوە.

٣. بانو نانەکەی خواردبوو.

٤. شادیار وێنەکەی دەکێشا.

٥. بریا شکۆ بەیەکەم دەرچووبا.

### خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری ئەم ڕستانە بکەین، دەبینین وشەکانی ( چوو، بینیوە، خواردبوو، دەکێشا، دەرچووبا)، هەموویان کاری ڕابردوون، هەر یەکەیان کردەوەیەکی پیشانداوەو دراوەتە پاڵ کەسێک یان شتێک، لە کاتی ڕابردوودا ڕوویداوە، واتە پێش کاتی ئاخاڤتن کارەکە ڕوویداوەو تەواویش بووە، بەڵام ئەگەر سەیری کاتی ڕوودانی کارە ڕابردووەکان بکەین دەبینین لە یەک جیاوازن.

### دەستور:

کاری ڕابردوو: ئەو کارەیە کردەوەیەک پیشاندەدات کە لە ڕابردوودا ڕوویداوەو دراوەتە پاڵ کەسێک یان شتێک، کاری ڕابردووی ڕاگەیاندن کاتی جیاوازی هەیە:

**١. کاری ڕابـردووی نزیـک: لـەڕووی دروستکردنییەوە لـە چـاوگ دروستدەکرێت بـە لابردنـی پیتـی (ن)ی چـاوگ، وەک:**

| کاری ڕابردووی نزیک | چاوگ |
|---|---|
| هەڵکشا | هەڵکشان |
| هێنا | هێنان |
| نووسی | نووسین |
| دانیشت | دانیشتن |
| خوێند | خوێندن |
| چوو | چوون |
| گەڕایەوە[١] | گەڕانەوە |

**٢. کاری ڕابردووی تەواو: بەم شێوەیە دروستدەکرێت:**

**(کاری ڕابردووی نزیک+ وە) وەک:**

**(قەدی چاوگ + وە)**

هێنا + وە = هێناوە

نووسی + وە = نووسیوە

چوو + وە = چووە[٢]

١. ئەگەر چاوگ کۆتایی بە بزوێنی (ا ، ی) هات ناوبەندی (ی) ددەدانێن.

٢. لە چاوگی (واوی) کە نیشانەی (وە) زیاد دەکرێت، بزوێنی (وو) ی درێژ کورتدەکرێتەوە بۆ (و) کورت.

بەڵام ئەگەر کاری ڕابردووی نزیک کۆتایی بە پیتی نەبزوێنی (ت،د) هاتبوو، پیتی بزوێنی (و) دەخرێتە نێوان کاری ڕابردووی نزیکو نیشانەی (وە) وەک:

دانیشت + و + وە = دانیشتووە

خوێند+ و + وە = خوێندووە

دەکرێت لەجیاتی نیشانەی (وە) نیشانەی (یە) بەکار بێت وەک:

هێنا + یە = هێنایە

نووسی + یە = نووسییە.

بەڵام دیسان ئەگەر کاری ڕابوردووی نزیک کۆتایی بە پیتی نەبزوێنی (ت، د) هاتبوو، پیتی بزوێنی (ی) دەخرێتە نێوانیان وەک:

دانیشت + ی + یە = دانیشتییە

خوێند + ی + یە = خوێندییە

لە هەندێک ناوچەی کرمانجی سەروو بەم شێوەیە دروستدەکرێت:

یا + ڕابردووی نزیک + ی ⟵ بۆ ڕەگەزی مێ

یێ + ڕابردووی نزیک + ی ⟵ بۆ ڕەگەزی نێر

وەک: یا + هینا + ی = یا هینای

یێ + چاند + ی = یێ چاندی

**تێبینی:** ئەم چاوگانەی کە پاشگری (ەوە ) یان پێوەیە بەم جۆرە ڕابردووی تەواویان لێدروستدەکرێت.

ئـ- لابردنی نونی چاوگ.

ب- دانانی نیشانەی (وە) لە شوێنی (ن)ی لابراو.

پ- دانانی ناوبەندی (ت) لە نێوان بزوێنەکان

خوێندنەوە ⟵ خوێند + ووە+ ت + ەوە = خوێندووەتەوە

دۆزینەوە ⟵ دۆزی + وە + ت + ەوە = دۆزیوەتەوە

**٣. کاری ڕابردووی بەردەوام بەم شێوەیە دروستدەکرێت:**

**(دە + ڕابردووی نزیک)**

وەک: دە + هێنا = دەهێنا

دە + نووسی = دەنووسی

دە + وەرگرت = وەردەگرت

دە + دروستکرد = دروستدەکرد

لە کرمانجی سەروودا لە جیاتی نیشانەی (دە)، نیشانەی (د) بەکاردێت وەک:

د + هێنا = دهێنا

د + چوو = دچوو

د + وەگرت = وەردگرت.

**٤. کاری ڕابردووی دوور بەم شێوەیە دروستدەکرێت:**

**کاری ڕابردووی نزیک + بوو:**

هێنا + بوو = هێنابوو

نووسی + بوو = نووسیبوو

چوو + بوو = چووبوو

وەرگرت + بوو = وەرگرتبوو

**تێبینی:**

١. کاری ڕابردوو بە ئامرازی (نە) دەکرێت بە نەرێ.

٢. کاری ڕابردووی نزیکی دانانی بەم شێوەیە دروستدەکرێت.

(کاری ڕابردووی نزیک + با) وەک:

هات+ با = هاتبا خوێند+ با = خوێندبا

## ڕاهێنان (١)

لەم چاوگانەی خوارەوەدا کاری ڕابردووی نزیکو دوور دروستبکە:
( پێشکەوتن، نقیسین، بردن، ئاقدان، داخستن )

## ڕاهێنان (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:
١. قەد لە چاوگ وەردەگیرێت بە لابردنی....
(ئەلف/ نون/ ئەلف و نون)
٢. ئەگەر (ن ) لە چاوگ لابدەین چ کارێکی لێ دروستدەکرێت......
(داخوازی/ ڕابردووی نزیک/ ڕانەبردوو)
٣. پرژە وانەکەی خوێندبوو. (خوێندبوو) کارێکی ڕابردووی.....
(دوور/ نزیک/ تەواو/ بەردەوام)
٤. کاری ڕابردووی دوور بەم شێوەیە دروستدەبێت......
(ڕابردووی نزیک+ ووە/ دە+ ڕابردووی نزیک/ ڕابردووی نزیک+ بوو)
٥. کاری ڕابردووی نزیکی دانانی بەم شێوەیە دروستدەبێت.....
(ڕابردووی نزیک+ با/ دە+ ڕابردووی نزیک/ ڕابردووی نزیک+ بوو)

## ڕاهێنان (٣)

لەم چاوگانەی خوارەوەدا کاری ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندنو کاری ڕابردووی نزیکی دانانی دروستبکەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە.
(سەرکەوتن، هەڵکێشان، خوێندن، یارمەتیدان، فرۆشتن )

## ڕاهێنان (٤)

لەم ڕستەی خوارەوەدا:

دوێنی پەخشان ڕۆژنامەی دەخوێندەوە.

١. وشەی (دوێنێ) چییەو ئەرکی چییە؟

٢. وشەی (ڕۆژنامە) شیبکەوە.

٣. کاری (دەخوێندەوە) کام جۆری کاری ڕابردووە؟ چۆن دروستکراوە؟

٤. بکەری ڕستەکە دیاربکە.

٥. لە کاری (دەخوێندەوە) کاری ڕابردووی تەواو دروستبکە.

٦. لە کاری (دەخوێندەوە) کاری ڕابردووی دوور دروستبکە.

٧. لەکاری (دەخوێندەوە) کاری ڕابردووی نزیکی دانانی دروستبکەو لەڕستەدا بەکاری بهێنە.

## دەمەکانی کاری ڕانەبردوو

١. ئێستا چیرۆک دەنووسم.
٢. ساڵێکی تر گەشت دەکەین.
٣. نازدار وانێ دخوینێت.
٤. ئەژی خەڵات دێ وەرگریت.

### خستنە ڕوو:

کاتێک سەیری ڕستەکانی سەرەوە دەکەین، دەبینین وشەکانی (دەنووسم، گەشت دەکەین، دخوینێت، دێ وەرگریت) هەموویان کاری ڕانەبردوون، هەر یەکەیان کردەوەیەک پیشاندەداتو دەدرێتە پاڵ کەسێک یان شتێک لە کاتی ئاخاڤتن، یان لە دوای ئاخاڤتن دەست پێدەکات.

کاری ڕانەبردوو دوو کاتی جیاوازی هەیە:

ئـ- کاری ڕانەبردووی ئێستا

کردەوەیەک پیشاندەدات، کە لەکاتی ئاخافتن یا لەدوای ئاخافتن دەست پێدەکات، بەم شێوەی خوارەوە دروستدەکرێت.

دە + ڕەگی کار + جێناوی لکاو

دە + چـ + یت = دەچیت

دە + نووس + م = دەنووسم.

لـه کرمانجـی سـەروودا لەجیاتـی نیشـانەی (دە)، نیشـانەی (د) بەکاردێـت بـۆ کاری ڕانەبـردووی ئێسـتا وەک:

(د + ڕەگی کار + جێناوی لکاو )

د + چ + م = دچم

د + نڤیس + ین = دنڤیسین

کاری ڕانەبـردووی ئێسـتا لـە کرمانجـی خـواروودا بەهـۆی هاوەڵـکاری کاتییـەوە دەردەکەوێـت وەک (ئێسـتا، وا، ئـەوا)، کـە دەچنـە پێـش کاری ڕانەبـردوو. وەک:

ئێستا دەچم بۆ قوتابخانە

وا دەڕۆم بۆ ماڵەوە.

ئەوا دەچن بۆ سەیران.

## ب- کاری ڕانەبردووی ئایندە

کردەوەیـەک پیشـاندەدات، کـە لـەدوای ئاخافتـن یەکسـەر دەسـت پێناکات، بەڵکو لـە ئایندەیەکی دوور دەسـت پێدەکات، ئینجا لـە شـێوەی کرمانجی خواروو نیشـانەیەکی تایبەتی نییـە، کـە جیایبکاتـەوە لـە کاری ڕانەبـردووی ئێسـتا، واتـە هـەر وەک ئـەو پێکدێـت:

دە + ڕەگی کار + جێناوی لکاو

دیسـان بەهـۆی هاوەلـکاری کاتییـەوە دەردەکەوێـت وەک (لەمـەودوا، بەیانـی، سـبەی، مانگێکـی تـر، سـاڵێکی تـر... ) کـە دەچنـە پێـش کاری ڕانەبـردوو.

بـەڵام لەشـێوەی کرمانجـی سـەروو، نیشـانەیەکی تایبەتـی هەیـە، کـە جیایدەکاتـەوە لـە کاری ڕانەبـردووی ئێسـتا، واتـە کاری ڕانەبـردووی

ئاینـده بـەم شـێوەیە دروسـتدەکرێت:
دێ + ڕەگی کار + جێناوی لکاو
دێ + کڕ + م = دێ کڕم
دێ + چـ + ین = دێ چین
دێ + نڤیس + ن = دێ نڤیسن.

**دەستور:**

کاری ڕانەبـردوو: کارێکـە، کـە کردەوەیـەک پیشـاندەدات و لـەدوای ئاخاوتـن ڕوودەدات، کردەوەکـە دەدرێتـە پـاڵ کەسـێک یـان شـتێک.
کاری ڕانەبـردوو دوو کاتـی هەیـە، کاری ڕانەبـردووی (ئێسـتا و ئاینده).لـە کرمانجـی خـوارووداکاری ڕانەبـردوو بـەم شـێوەیە دروسـتدەکرێت
(دە + ڕەگی کار + جێناوی لکاو)
کاری ڕانەبـردووی ئێسـتاو ئاینـده بـە هـۆی هاوەڵکاری کاتییـەوە لـە یـەک جیادەکرێنـەوە.
بـەڵام لەشێوەی کرمانجی سـەرووداکاری ڕانەبردووی ئێسـتا بەنیشـانە جیادەکرێتـەوەو بـەم شـێوەیە دروسـتدەکرێت.
(د + ڕەگی کار + جێناوی لکاو)
کاری ڕانەبردووی ئاینده بەم شێوەیە دروستدەکرێت.
(دێ + ڕەگی کار + جێناوی لکاو)

### تێبینی:

١. کاری ڕانەبردووی ئێستاو ئایندە بە ئامرازی (نا) دەکرێن بە نەرێ، کە شوێنی نیشانەی (دە، د، دێ) دەگرێتەوە.

٢. کاری ڕانەبردووی ئێستاو ئایندە، کە خوێندمان، کاری ڕانەبردووی ڕاگەیاندن بوو.

٣. جگە لەمە کاری ڕانەبردووی دانانی هەیە، کە بەم شێوەیەی خوارەوە پێکدێت.

لە کاری ڕانەبردووی ڕاگەیاندن نیشانەی (دە، د، دێ) دەگۆڕێت بۆ (ب) وەک:

(ب+ ڕەگی کار+ جێناوی لکاو)

| | |
|---|---|
| دەخوێنم | بخوێنم |
| دەچم | بچم |
| دەنووسێت | بنووسێت |

٤. کاری ڕانەبردووی دانانی بە (نە) نەرێ دەکرێت

| | |
|---|---|
| بخوێنم | نەخوێنم |
| دەچم | نەچم |

## ڕاهێنان (١)

لـەم چاوگانـەی خـوارەوەدا کاری ڕانەبـردوو دروسـتبکەو لەڕسـتەدا بەکاریـان بهێنـە:

( خواستن، پاراستن، دەرچوون،چاندن، دانان، وەرگرتن )

## ڕاهێنان (٢)

ئـ- لـە شێوەی کرمانجی خـوارووادا بەهـۆی چییـەوە کاری ڕانەبردووی ئێسـتاو ئایندە لێک جیادەکەینـەوە؟ بـە نمونـە ڕوونیبکـەوە.

ب- لـە شـێوەی کرمانجـی سـەرووادا چۆن کاری ڕانەبـردووی ئێسـتاو ئاینـدە لێـک جیادەکەیتـەوە؟ بـە نمونـە ڕوونیبکـەوە.

## ڕاهێنان (٣)

لە ڕستەی (ڕاپۆرتەکە بەباشی دەنووسم)

١. بکەری ڕستە کە دیاربکە. بۆ خراوەتە ئەویّ؟

٢. کارەکە چ جۆرە کارێکە؟ چۆن دروستکراوە؟

٣. وشەی (بەباشی) شیبکەوە.

٤. کاری ڕستەکە بکە بە نەرێو ڕستەکە سەر لەنوێ بنووسەوە.

٥. وشەی (ڕاپۆرتەکە) شیبکەوە.

٦. دەتوانیت کارەکە بکەیت بە کاری ڕانەبردووی دانانی؟ چۆن؟

٧. دەتوانیت کارەکە بکەیت بە کاری ڕابردووی تەواو؟ چۆن؟

## ڕاهێنان (٤)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. ئەز چیرۆکی دێ نڤیسم (دێ نڤیسم) کاری ڕانەبردووە بۆ کاتی....

(ئایندە/ ئێستا / هەردووکیان)

٢. کاری ڕانەبردوو لە کرمانجی خواروو بەم شێوەیە دروستدەبێت.......

(ڕابردووی نزیک+ ووە/ دە+ ڕابردووی نزیک/ دە+ ڕەگی‌کار+ جێناوی‌لکاو)

٣. کاری ڕانەبردوو بۆ ئایندە لە شێوەزاری کرمانجی سەروو بەم شێوەیە دروستدەکرێت......

(د+ڕەگی‌کار + جێناوی‌لکاو/ دە+ ڕابردووی نزیک/ دێ+ڕەگی‌کار+جێناوی‌لکاو)

٤. کاری ڕانەبردوو بۆ ئێستا لە کرمانجی سەروو بەم شێوەیە دروستدەبێت.......

(د+ڕەگی‌کار + جێناوی‌لکاو/ دە+ ڕابردووی نزیک /دە+ڕەگی‌کار+جێناوی‌لکاو)

٥. کاری ڕانەبردووی دانانی بەم شێوەیە دروستدەبێت.......

(ب+ڕەگی‌کار + جێناوی‌لکاو/ دە+ ڕابردووی نزیک / دە+ڕەگی‌کار+جێناوی‌لکاو)

## ڕاهێنان (٥)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١- ئەم چیرۆکێ دێ نڤیسین.

٢- هەستیار هۆنراوەکە بڵاودەکاتەوە.

## کاری داخوازی

١. لاوی کورد بخوێنە خوێندن مەرهەمە بۆ زامی گەل
تیشکی زانینە ئەدا ڕۆشن بە ئەستێرەی ئەمـــەل

**(دڵزار)**

٢. بەبێ باکی بەسەریا ڕامەبوورن حورمەتی بگـرن
گوڵاڵە سوورەی ئەم سەحرایە خوێناوی جگەرتانە.

**(ئەحمەد موختار جاف)**

٣. مەرحەمەت کە زوو برۆ قاسید بڵێ دەردی دڵم
نازی با پوچت ئەکێشم من بە تۆزو گــەردەوە

**(تاهیر بەگی جاف)**

٤. گوهـ بدە ئاهو فیغانو لەرز ئوکوڤانـــــە دل
دل ددلدا یێ دسۆژیت پویشو کاو خەرمانە دل

**(کەتانی)**

٥. هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمــە
سەر پۆش فرێ دە چ وادەی شەرمە

**(بێکەس)**

٦. دلبەر تو وەرە جارەک دا ئەز تە ببینم ئەز دل بریـــــنم
ئەز ئیرۆ ل سەر تەختی سوخەن پیرێ ئەڤینم دەر ڕویێ زەمینم

**(جگەر خوێن)**

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری دێرە هۆنراوەکان بکەین، دەبینین پەیڤەکانی (بخوێنە، بگرن، ڕامەبوورن، مەرحەمەت کە، بڕۆ، بڵێ، گوهـ بدە، هەستە، تێکۆشە، فڕێ دە، وەرە) هەموویان کاری داخوازینو ڕوودانێک پیشاندەدەن کە لەدوای ئاخافتن یەکسەر ڕوو دەدەن کە ئاخێوەر واتە کەسی یەکەم داوا لە گوێگر واتە (کەسی دووەمی تاک یان کۆ) دەکات بۆ ئەنجامدانی کارێک یەکسەر لەدوای ئاخافتن.

ئەگەر سەیری کاری داخوازی بکەین لە ڕووی پێکهێنان واتە لەڕووی دروستکردنەوە، دەبینین بەشێوەیەکی گشتی کاری داخوازی بەم شێوەیەی خوارەوە دروست دەکرێت:

(ب+ ڕەگی کار + جێناوی لکاو)

یەکەم:

ب + ڕەگی کار + ە : بۆ کەسی دووەمی تاک:

ب + خوێن + ە = بخوێنە.

ب + نڤیس + ە = بنڤیسە.

دووەم:

ب + ڕەگی کار + ن: بۆ کەسی دووەمی کۆ

ب + گر + ن = بگرن

ب + هێن + ن = بهێنن

١. ئەگەر ڕەگی کار کۆتایی بە پیتی نەبزوێن هاتبوو وەک (خوێن، نڤیس) جێناوی (ە) دەردەکەوێتو دەبێتە بکەری ڕستە.

٢. ئەگەر ڕەگی کار کۆتایی بە پیتی بزوێنی (ۆ – وو – ی – ێ – ە) هاتبوو جێناوی (ە) بۆ کەسی دووەمی تاک بەکار ناهێنرێت، واتە

دەرناکەویت چونکە دوو پیتی بزوێن بەدوای یەکتردا لە برگەیەکدا نایێن. وەک کاری داخوازی (برۆ، بنوو، بلێ، بژی، بکە).

جێناوی لکاو (ن) بۆ کەسی دووەمی کۆ هەمیشە دەردەکەوێت، ئەگەر رەگی کار کۆتایی بە پیتی نەبزوێن یان بزوێن هاتبێت.

٣. ئەگەر کاری داخوازی دارێژراو یان لێکدراو بوو نیشانەی (ب) دروستە لە کاتی ئاخافتن یا نووسیندا دەرنەکەوێت، وەک:

ئ . کاری داخوازی دارێژراو

(تێبکۆشە، دابنیشە) دەتوانرێت بگوترێت (تێکۆشە، دانیشە).

ب. کاری داخوازی لێکدراو

(فرێبدە، تەواوبکە، یارمەتیبدە) دەتوانرێت بگوترێت (فرێدە، تەواوکە، یارمەتیدە).

٤. کاری داخوازی بە ئامرازی (مە) دەکرێت بە نەرێ و شوێنی نیشانەی (ب) دەگرێتەوە، وەک: (بخۆ، راببورن، یارمەتیبدە) دەبێتە (مەخۆ، رامەبورن، یارمەتیمەدە).

٥. ئەگەر کاری داخوازی سادە بوو نیشانەی (ب) دەچێتە سەرەتای کاری داخوازی، بەڵام ئەگەر دارێژراو یان لێکدراو بوو دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکە.

٦. هەندێک کاری داخوازی هەیە لەرووی دروستکردنییەوە لەو دەستوورەی کە باسمانکرد لا دەدات، وەک:

(وەرە، بچۆ).

**دەستور:**

## کاری داخوازی:

ئەو کارەیە کە کەسی یەکەم داوا لە کەسی دووەمی تاک یان کۆ دەکات بۆ ئەنجامدانی یان ئەنجامنەدانی کارێک یەکسەر لەدوای ئاخاڤتن.

بەم شێوەیە پێک دێت:

{ ب + ڕەگی کار + جێناوی لکاو}

جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاک (ە) بۆ کەسی دووەمی کۆ (ن)

### ڕاهێنان (١)

لەم چاوگانەی خوارەوە کاری داخوازی دروستبکەو لەڕستەدا بەکاریان بهێنە:

(هەڵکێشان، یارمەتیدان، هەڵاتن، گۆتن، دامەزراندن، ئاڤاکرن).

### ڕاهێنان (٢)

لە ڕستەی (پڕۆژەکە بەخێرایی تەواوبکەن)

١- کاری داخوازی دیاربکە، چۆن دروستکراوە؟

٢- بکەری ڕستەکە دیاربکە.

٣- وشەی پڕۆژەکە شیبکەوە.

٤- لە کاری (تەواوبکەن) دەگونجێ نیشانەی (ب) لاببرێت؟ بۆچی؟

٥- کاری (تەواوبکەن) بکە بە نەرێو ڕستەکە سەر لەنوێ بنووسەوە.

٦- وشەی (بەخێرایی) چییە؟ ئەرکی چییە؟ چۆن دروست کراوە؟

## ڕاهێنان (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. (بنووسن، بکێڵن) کاری داخوازییە، (ن) جێناوی لکاوە ئەرکی :

(بکەر / بەرکار / دیارخەری ناو)

٢. کاری داخوازی نەرێ دەکرێت بە :

(مە / نا / نی)

٣. کاری داخوازی لە چاوگی خواردن :

(خوارد / بخۆ / بخۆم)

٤. کاری داخوازی (بڕۆ، بنوو) وەرگیراوە لە چاوگی :

(خەوتن و نووستن / ڕۆیشتن و نووستن / نواندن و ڕواندن)

٥. (بکرە، بخوێنە) کاری داخوازییە، (ە) جێناوی لکاوە بۆ کەسی :

(دووەمی کۆ / دووەمی تاک / سێیەمی تاک)

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١. لە جەژنی نەورۆزدا جلی جوان لەبەربکەن.

٢. دیارییەکە وەرگرن.

## کاری بکەر دیارو بکەر نادیار
## لە شێوەزاری کرمانجی خوارووا

| ( ئـ ) کاری بکەر دیار | ( ب ) کاری بکەر نادیار |
|---|---|
| ١. شاد گوڵەکەی چاند. | ١. گوڵەکە چێنرا. |
| ٢. کوڕەکان وانەکانیان نووسییەوە. | ٢. وانەکان نووسرانەوە. |
| ٣. جوتیارەکە زەوییەکە دەکێڵێت. | ٣. زەوییەکە دەکێڵرێت. |
| ٤. تاڤگە نامەکانی دەخوێنێتەوە. | ٤. نامەکان دەخوێنرێنەوە. |

لەمەوبەر زانیمان، کاری تێپەڕ، بەهۆی وشەیەکی ترەوە واتای ڕستەکە تەواودەکاتو دەبێتە بەرکاری کارەکە، ئەم ڕاستییە لە ڕستەکانی کۆمەڵەی (ئـ) دا بە تەواوی بەدیدەکرێت.

١. لە ڕستەی یەکەمدا (شاد) کە (بکەر)ە کارێکی کردووەو ئەرکی کارەکەی یەکسەر کەوتۆتە سەر (گوڵەکە)و بووە بە بەرکاری کاری (چاند)و واتای ڕستەکەشی تەواوکردووە، بەڵام لە ڕستەی یەکەمی بەشی (ب)دا لەبەر ئەوەی نەمانزانیوە کێ (گوڵەکەی چاند)ووە، یان نەمانویستووە ناوی (شاد) بێنین، کە (بکەر)ی کارەکەیە، ڕستەکەمان لە شێوەی ڕستەی بکەر نادیار دەربڕیوە.

بۆ ئەم مەبەستەش، (بکەر)ی کارە ئاشکرایەکەو هەرچی وشەیەک، کە پەیوەندی بە (بکەر)ەوە هەیە لە ناو ڕستەکەدا لای دەبەینو بەرکارەکە دەچێتە شوێنیو کارەکە دەخەینە سەر شێوەی کارێکی بکەر نادیار، بەو شێوەیەی کە لەسەرەوە پیشانمان داوە، بەم پێیە ڕستەکە دەبێتە (گوڵەکە چێنرا)و (گوڵەکە) دەبێتە جێگری (بکەر).

٢. لە ڕستەی دووەمدا هەمان ڕێگەمان گرتووە بۆ گۆڕینی کاری بکەر دیار بۆ کارێکی بکەر نادیار، بەڵام کە (بەرکار)ەکە دەچێتە شوێنی (بکەر) پێویستە بە پێی کەس‌و ژمارەی جێگری (بکەر)ەکە کارە بکەر نادیارەکەش بگۆڕێت، لەبەر ئەمە ڕستەکە دەبێتە (وانەکان نووسرانەوە).

٣. لە ڕستەکانی (سێیەم‌و چوارەم)دا کاری (دەکێڵێت)و (دەخوێنێتەوە) دوو کاری ڕانەبردووی تێپەڕن، چونکە (بکەر)ەکانیان ئاشکران، بۆ گۆڕینی ئەم جۆرە کارانە، بە پێی ئەو دەستورەی لە سەرەوە دەرمانخست، (بکەر)ەکان لەناو ڕستەکاندا لا دەبەین‌و (بەرکار)ەکان دەخەینە شوێنیان‌و کارەکانیش لەو شێوانەی، کە لە ڕستەکانی کۆمەڵەی (ب)دا نیشاندراون بەکار دەهێنین.

نیشانەی ( رێ ) کە بۆ کاری ڕانەبردووە هەروەها جێناوی لکاوی (ێت) دەچێتە سەر (رێ) دەبێتە (رێت)

**دەستور:**

١. کاری بکەر دیار: ئەو کارەیە کە یەکسەر دەخرێتە پاڵ (بکەر)ەکەی‌و لە ناو ڕستەکەشدا باس دەکرێت.

٢. کاری بکەر نادیار: ئەو کارەیە کە (بکەر)ەکەی لەناو ڕستەدا باس ناکرێت‌و (بەرکار)ەکەی دەبێتە جێگری (بکەر)ەکەی.

٣. تەنیا کاری تێپەڕی دیار دەگۆڕێت بۆ کاری بکەر نادیار.

٤. لەم گۆڕینەدا پێویستە بە وردی سەرنجی (تاکو کۆ)ی جێگری (بکەر) بدەین‌و بەو پێیە ئاگاداری ژمارەو کەسی کارە بکەر نادیارەکە بین.

٥. ئەگەر کارە تێپەڕەکە:

ئـ - ڕابردوو بوو، ڕەگی کار وەردەگرین‌و پاشگری (را)ی دەخەینە سەر وەک:

| چاوگ | ڕەگی کار | ڕابردووی نادیار |
|---|---|---|
| خووساندن | خووسێن | خوسێن + را = خوسێنرا |
| کێڵان | کێڵ | کێڵ + را = کێڵرا |
| شوشتن | شۆ | شۆ + را = شۆرا |
| نووسین | نووس | نووس + را = نووسرا |

ب- ڕانەبردوو بوو، ڕەگی کار وەردەگرین‌و پاشگری (رێ)ی دەخەینە سەر. وەک:

| چاوگ | ڕەگی کار | ڕانەبردووی نادیار |
|---|---|---|
| نووسین | نووس | دە+ نووس + رێ = دەنووسرێ |
| خوێندن | خوێن | دە + خوێن + رێ = دەخوێنرێ |

**تێبینی:**

١. کاتێک هەندێ کار دەکرێن بە کاری بکەر نادیار لە دەستور لادەدەن، چونکە بە ڕەگی کار ناکرێن بە کاری بکەر نادیار، بەڵکو بە قەدی چاوگ دەکرێن، واتە:

ئـ . ڕابردوو

قەدی چاوگ + را

گوتن: گوت + را = گوترا

ویستن: ویست+ را = ویسترا

ب. ڕانەبردوو

دە + قەدی چاوگ + رێ

دە + گوت + رێ = دەگوترێ

دە + ویست+ رێ = دەویسترێ

٢. لە کاتی دروستکردنی کاری بکەر نادیار، ئەگەر هاتوو ڕەگی کار کۆتایی بە بزوێن هات، ئەوا پەیڕەوی ئەم خاڵانە دەکەین

ئـ . بزوێنی (ێ، ە) لە ناو دەچن.

| | | |
|---|---|---|
| دانان | دا + نێ + را | دانرا |
| کردن | کە + را | کرا |

ب. بزوێنی (ۆ) دەگۆڕێت بۆ بزوێنی ( و)

| | | |
|---|---|---|
| خواردن | خۆ + را | خورا |

٣. کاری بکەر نادیار بۆ کاتی ڕابردوو هەموو دەمکاتەکانی هەیە وەک (نزیک، تەواو، بەردەوام، دوور)

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستانە لە کاری بکەر دیارەوە بگۆڕە بۆ کاری بکەر نادیار:

١. منداڵەکە هێلکەیەکی خوارد.

٢. قارەمانێک فڕۆکەیەکی دوژمنی خستە خوارەوە.

٣. ئەندازیارەکان خانووەکان دروستدەکەن.

٤. ئەوان چوار جار وانەکە دەنووسنەوە.

٥. ئەو هەموو ڕۆژێ سێ جار دەموچاوی دەشوات.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم کارانە لە کاری بکەر نادیارەوە بگۆڕە بۆ کاری بکەر دیار:

١. ڕۆمانەکە چاپکرا.

٢. دوو چاڵ هەڵکەنرا.

٣. دوێنێ دیوارەکانو سەربانەکان سواخدران.

٤. شەش مانگە باخەکە ئاو دەدرێ.

٥. تابلۆیەک دەکێشرێت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم کارە بکەر نادیارانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(خورا، دەنوسرێت، دەبینرێت، دەخوێنرێ، پێشکەشدەکرێ، هەڵدرا).

## ڕاهێنانی (٤)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. پەنجەرەکە شکێنرا، (شکێنرا) کاری ڕابردووی بکەر نادیاری:
(نزیک/ دوور/ تەواو/ بەردەوام)

٢. نیشانەی کاری بکەر نادیار لە کرمانجی خواروو بۆ ڕابردوو:
( رێ / را / هاتە)

٣. گوڵەکە چێنرابوو، (چێنرابوو) کاری رابردووی بکەر نادیاری:
(نزیک، دوور، بەردەوام، تەواو)

٤. دیواری باخەکە ڕوخێنرا، ئەو ڕستەیە بکەر:
(دیارە / نادیارە / هیچیان)

٥. کاری دیار لە ڕستەدا یەکسەر دەخرێتە پاڵ:
(بکەر/ هاوەڵناو/ ئامرازی دانەپاڵ)

## ڕاهێنانی (٥)

شیکردنەوە:

١. دیواری باخەکە دروستکرا.

دیوار : ناوە، تاکە، نەناسراوە، دیارخراوە.

ی : ئامرازی دانەپاڵ.

باخەکە: ناوە، تاکە، ناسراوە، دیارخەری ناوی (دیوار)ە.

دیواری باخەکە: گرێی ناوییە، جێگری بکەرە.

دروستکرا: کاری ڕابردووی نزیکی بکەر نادیارە.

٢. ئەم ڕستانە شیبکەوە:

ئـ - تۆپەکە هێنرابوو.

ب- پاقلەکە لە مەنجەڵەکەدا کوڵێنراوە.

پ - گەنم چۆن دەچێنرێت؟

## وەرزی دووەم

# کاری بکەر دیارو کاری بکەر نادیار
# لەشێوەزاری کرمانجی سەروودا

| (ئـ) | (ب) |
| --- | --- |
| کاری بکەر دیار | کاری بکەر نادیار |
| ١. شڤانی پەز چەراند. | ١. پەز هاتە چەراندن. |
| ٢. ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ ئاڤدایە. | ٢. ڕەز هاتییە ئاڤدان. |
| ٣. وێ نان دخوار. | ٣. نان دهاتە خوارن. |
| ٤. وی کەوەک گرتبوو. | ٤. کەوەک هاتبوو گرتن. |
| ٥. پەری چیرۆکێ دنڤیسیت. | ٥. چیرۆک دهێتە نڤیسین. |
| ٦. ئەز نامەکێ دێ نڤیسم. | ٦. نامەک دێ هێتە نڤیسین. |

کاتێک سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین پەیڤەکانی (چەراند، ئاڤدایە، دخوار، گرتبوو، دنڤیسیت، دێ نڤیسم) هەموویان کاری تێپەڕن، چونکە کاریگەری کارەکانی کەوتۆتە سەر ناوێکی تر کە (بەرکار)ەو، هەر یەکەیان کردەوەیەکیان پیشانداوەو خراونەتە پاڵ بکەرەکانیان‌و هەموویان بەسەر یەکەوە ڕستەیەکی بکەر دیاریان پێکهێناوە.

کاتێک سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) دەکەین، دەبینین پەیڤەکانی (هاتە چەراندن، هاتییە ئاڤدان، دهاتە خوارن، هاتبوو گرتن، دهێتە

ڤیسین، دێ هێته ڤیسین) هەموویان کاری بکەر نادیارن، چونکە هەر یەکەیان کردەوەیەکی پیشانداوەو نەخراونەتە پاڵ کەسێکی دیارو ئاشکرا (واتە نازانرێ کێ کارەکەی ئەنجامداوە)، لەبەر ئەوە بەم جۆرە کارانە دەگوترێت کاری بکەر نادیار.

کەواتە لە دوای خوێندنەوەو تێرامانمان لە شێوەزاری (کرمانجی سەروو) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە یاسای گۆڕینی کاری بکەر دیار بۆ کاری بکەرنادیار جیاوازە لە شێوەزاری (کرمانجی خواروو)، چونکە لە کرمانجی سەروودا کاری ڕستەکە دەگەڕێتەوە بۆ (چاوگ) و پاشان کاری یاریدەدەری (هات)یش بە پێی جۆری کاتی کارەکە بەکار دەهێنین.

## کاری ڕابردوو:

### ١. کاری ڕابردووی نزیک:

ئەم جۆرە کارە بە پێی ئەم یاسایە دروست دەکرێت:

هاتە + چاوگ

هاتە + چاندن  هاتە چاندن

هاتە + کڕین  هاتە کڕین

### ٢. کاری ڕابردووی تەواو:

ئەم جۆرە کارەش بەپێی ئەم یاسایە دروست دەکرێت:

هاتییە + چاوگ

هاتییە+ ڤیسین  هاتییە ڤیسین

هاتییە + لێنان  هاتییە لێنان

٣. کاری ڕابردووی بەردەوام:

دهاتە + چاوگ

دهاتە + ئینان = دهاتە ئینان

دهاتە + ڕێشتن = دهاتە ڕێشتن

٤. کاری ڕابردووی دوور:

هاتبوو+ چاوگ

هاتبوو + خوارن = هاتبوو خوارن

هاتبوو + خواندن = هاتبوو خواندن (خاندن)

## کاری ڕانەبردوو:

لە شێوەزاری کرمانجی سەروودا کاری ڕانەبردوو بۆ دەمی ئێستاو ئایندە بە ئاشکرا دەردەکەوێت لە کاتی ئاخاوتندا، لەبەرئەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت لە کاتی گۆڕینی کاری بکەردیار بۆ کاری بکەرنادیار:

### ١. کاری ڕانەبردوو بۆ دەمی ئێستا:

کاری یاریدەدەری (دهێتە) بەکاردێت لە پێش چاوگەکەدا:

دهێتە + چاوگ

دهێتە + کڕین = دهێتە کڕین

دهێتە + نڤیسین = دهێتە نڤیسین

**٢. کاری ڕانەبردوو بۆ دەمی ئایندە:**

کاری یاریدەدەری (دێ هێتە) لە پێش چاوگەکەدا بەکاردێت:

دێ هێتە + چاوگ

دێ هێتە + فرۆتن = دێ هێتە فرۆتن

دێ هێتە + هاڤێتن = دێ هێتە هاڤێتن

**دەستور:**

## ١. کاری بکەردیار:

ئەو کارەیە، کە کردەوەو ڕەفتارێک لە کاتێکی دیاریکراو (ڕابردوو یان ڕانەبردوو) دا پیشانداوە یان پیشاندەداتو ئەو کارەش، کە دراوەتە پاڵ بکەرەکەی، دیارو ئاشکرایە لە ڕستەکەدا.

## ٢. کاری بکەرنادیار:

ئەو کارەیە، کە کردەوەو ڕەفتارێک لە کاتێکی دیاریکراو (ڕابردوو یان ڕانەبردوو)دا پیشانداوە یان پیشاندەداتو ئەو کارەش نەدراوەتە پاڵ بکەرەکەیو دیارو ئاشکرا نییە لە ڕستەکەدا.

### ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا کاری بکەر دیار بگۆڕە بۆ کاری بکەر نادیار:

١.سەرداری وانە نڤیسی.

٢. وێ هەڤیر کربوو.

٣. نەسرین دێ شیڤێ لێنێت.

٤. من کتێب ژ وی وەرگرتییە.

## ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. نیشـانەی کاری بکەرنادیـار لـە کرمانجـی سـەروودا بۆڕانەبـردوو دەمـی ئێسـتا:

(ڕەگی کار + رێ / دهێتە + چاوگ / دێ هبێتە + چاوگ)

٢. نیشـانەی کاری بکـەر نادیـار لـە کرمانجـی سـەروودا بـۆ ڕابـردووی نزیـک:

(دهاتە + چاوگ / دێ هێتە + چاوگ / هاتە + چاوگ)

٣. پەز هاتە چەراندن، (هاتە) کارێکی:

(تێپەڕە / ڕابردووی تێنەپەڕە / یاریدەدەرە)

٤. کەوەک هاتییە گرتن، ڕستەیەکی بکەر نادیارە کارەکەی:

(ڕابردووی تەواوە / ڕانەبردووی ئایندە / ڕانەبردووی ئێستا)

٥. نان دهاتە خوارن، ڕستەیەکی بکەر نادیارە کارەکەی ڕابردووی:

(تەواو / نزیک / بەردەوام)

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شییبکەوە:

١. پەز دێ هێتە دۆشین.

٢. گۆڤارەکان بە چاکی دابەشکراون.

## جێناوی پرس

ئەم نووسینە بخوێنەوە:

جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێک پسپۆرو شارەزا لە بواری چاندن‌و کشتوکاڵدا چووین بۆ گوندێن دەوروبەرێ هەولێرێ، لەوێ چاومان بە کۆمەڵێک جوتیار کەوت، پاش بەخێر هێنان‌و حەسانەوە، یەک لە شارەزایان هەندێک پرسیاری لە سەرۆکی کۆمەڵەی جوتیارانی گوند کرد، پرسی: تۆ چیت‌و ناوت چییە؟ لەم جوتیارانە کامیان ئەمساڵ گەنمی ڕەشگوڵی چاندووە؟ سەرۆکی کۆمەڵە بەرسڤاوی داو گۆت: ئەز جوتیارم‌و ناڤێ من باپیرە. ئەمساڵ مام بایز ئەم جۆرە گەنمەی چاندووە، لە پاشان پرسیاری لێکردوو گوتی:

کێ تا ئێستاش زەویی خۆی بە گاسن دەکێلێت؟ دیسا سەرۆکی کۆمەڵە بەرسڤ داو گۆت: مام حەمەدو مام باپیر تا نهۆژی هەر ب گاسنی زەڤییێن خۆ دکێلن، چونکو دەستێ وان کورتەو ئەو نەدارن. ژ بەر هندێ شارەزای فەرمان دا کو ئەڤ ساڵە ژ لایێ وەزارەتا کشتوکاڵ‌و چاندنێ ڤە، تراکتەرەک بۆ وان بێتە کڕین داکو زەڤییێن خۆ پێبکێلن.

دیسان چەند پرسیارێکی دی ئاراستە کردو گوتی: بەرهەمەکانتان بە چی دەگوازنەوە بۆ شار؟ لەم جوتیارانە کیهەیان بەرهەمی لە هەموویان پترە؟ کیژان زەڤییێن بەراڤ هەنە؟ درەختێ چی لە زەوییەکانیان دەچێنن؟ لە وەڵامدا سەرۆکی جوتیاران گوتی: هەندێکمان بەرهەمەکانمان بە تراکتەرو هەندێکیشمان بە وڵاخ دەگوازینەوە بۆ شار، لەم جوتیارانەش خاڵە بایز بەرهەمی لە هەموویان پترە. هەر خاڵ بایز خۆی زەوی بەراوی هەیە، جوتیاران

داری میوەو درەختی ئەسپیندارو چنار لە زەوییەکانیان دەچێنن. پشتی ڤێ سەرەدانێ، شارەزاو پسپۆرێن بوارا چاندنو کشتوکالێ خاترا خۆ خواستو زڤڕینەڤە جهێ خۆ.

## خستنەڕوو:

لە بەرنامەی سالانی پێشوودا زانیمان، کە ڕستەی ڕاگەیاندن بە دوو شێواز دەکرێ بە ڕستەی پرس:

ئـ - یان بەهۆی جۆری دەربرینو ئاوازی تایبەتی پرسەوە.

ب - یان ژی ب بکار هینانا پەیڤەکا پرسی، ئەو پەیڤ ژی یان دبیتە (جێناو) یان (هاوەڵناو) یان (هاوەڵکار)ێ پرسێ.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دەقی نووسینەکە، دەبینین لە گەلەک شوێناندا ڕستەکان لە شێوەی پرسدان، بۆ ئەم مەبەستەش پەیڤێکی پرس بەکار هاتووە، بەم جۆرە:

١. لەڕستەی (لەم جوتیارانە کامیان ئەمساڵ گەنمی ڕەشگوڵی چاندووە؟)دا، دەبینین ڕستەکە بەهۆی پەیڤی (کامیان)ەوە کراوە بە ڕستەی پرس، پەیڤەکەش لە شوێنی ناوی ئەو جوتیارە بەکارهاتووە، کە ئەو جۆرە گەنمەی چاندییە، بەکارهێنانەکەش لە شێوەی پرسدایە، کە پرسەکەش وەڵام دەدرێتەوە، پێویستە ناوی ئەو جوتیارە باسبکرێ کە پرسەکەی لە بارەیەوە کراوە، هەر لەبەر هەندێ پەیڤەکە بە (جێناوی پرس) دادەنرێت.

٢. لە ڕستەی (کێ تا ئێستاش زەویی خۆی بە گاسن دەکێڵێت؟)دا، ڕستەکە بەهۆی پەیڤی (کێ) کراوە بە ڕستەی پرسو ئەم پەیڤەش لە شێوەی پرسدا لە شوێنی ناوی ئەو کەسە هاتیە بکار هینان

کو زەویێ خۆ ب گاسنی دکێلیت، هەر ژبەر هندێ ئەو ژی دبیتە (جێناوی پرس)و هەروەسا دبیتە (بکەر)ێ ڕستەی.

٣. هەروەها لە ڕستەی پرسی: تۆ چیتو ناوت چییە؟ ڕستەکە بەهۆی پەیڤی (چی) دووجار کراوە بە ڕستەی پرس، کە دیارە جارێکیان لە کارو پیشەی کابراو جارێکیش لە ناوەکەی دەپرسێت. لە هەردوو باریشدا وەڵامەکەی بە ناوێک دەدرێتەوە، واتە پەیڤی (چی) لە شوێنی ناوەکە بەکاردێت، بۆیە دەبێتە (جێناوی پرس).

بێجگە لەو ڕستانەی، کە باسکران، نووسینەکە گەلێک ڕستەی تری تێدایە، کە لەشێوەی پرسدانو پەیڤەکانی وەک (جێناوی پرس) بەکارهاتوون.

**دەستور:**

جێناوی پرس، ئەو پەیڤانەن کە:

ئـ - لە جێی ناوی کەسێک، یان شتێک، لە شێوەی پرسکردندا بەکاردێنو ئەرکی ناوە لێپرسراوەکەش لە ڕستەکەدا دەبینین، ئەرکەکانیش ئەڤەنە:

**جێناوی پرس دەبێتە:**

١. بکەری ڕستە، وەک: کێ شاری سولەیمانی دروستکرد؟

٢. بەرکاری ڕستە، وەک: دوێنێ کێت دیت؟

٣. تەواوکەری بە یاریدە، وەک: تە ئەڤ پەرتوکە ژ کێ وەرگرت؟

٤. دیارخەری ناو، وەک: کوڕێ کێ لە کوردستاندا هاتە شەهیدکرن؟

٥. تەواوکەری کاری ناتەواو، وەک: شیرین کێیە؟

٦. نیهادی ڕستە، وەک: کێ زیرەکە؟

٧. جێگری بکەر، وەک: کێ بینرا؟

ب. ئەو پەیڤێن کو دبنە جێناوی پرس ئەڤەنە:
١. کێ – کی : لە جێی ناوی کەسێک لە شێوەی پرسدا بەکاردێت.
٢. کام – کامە- کیهە- کیهان- کیشک – کیژان: هەموویان یەک واتایان هەیە، بۆ جوداکردنەوەی کەسێک، یان شتێک لە ناو کۆمەڵە کەسێک، یان شتێک بەکاردێن.
پ . ( چ – چی) : لە جێی ناوی شتێک بەکاردێت، لە شێوەی پرس، وەک: کتێبی چی دەخوێنییەوە؟

## ڕاهێنانی (١)

ئەرکی جێناوی پرس لەم ڕستانەدا دەست نیشانبکە:

١. قوتابییان، کێیان لە ناو باخچەکەدا دیت؟
٢. کێ نەخۆش کەوت؟
٣. چ کەوتە خوارەوە؟
٤. ڕەخنەکەتان لە بابەت چییە؟
٥. کیهەیان لە پێشبرکێدا بە یەکەم دەرچوو؟
٦. ئێوە گۆشتی چی دەخۆن؟

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانە شیبکەوە:

١- کامە بە یەکەم دەرچوو؟
٢- دوێنێ کێت بینی؟

## هاوەڵناوی پرس

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١. چەند جۆرە پێنوست کڕی؟

تە چەند (چقاس) پارە هەیە؟

٢. کام ئەستێرە جوانە؟

٣. کیژان ژن ژ هەمیا درێژترە؟

٤. جەژنی نەورۆزی ئەمساڵ کوو بوو؟

چۆن دیارییەکت بۆ براکەت نارد؟

دیارییەکی چۆنت بۆ نەوزادی برات نارد؟

تە دیارییەکا چاوا بۆ نەوزادێ برایێ خۆ هنارد؟

٥. چ قوتابییێک لە تاقیکردنەوە لە هەموو وانەکان دەردەچێت؟

٦. پۆلی چەندەمیت؟

ئازاد چەندەمین قوتابییە، کە لە ڕێزماندا دەرچووە؟

### خستنەڕوو:

لە ڕستەکانی سەرەوەدا، دەبینین لە کۆتایی هەر ڕستەیەک نیشانەیەکی پرس (؟) هەیە، بۆمان دەردەکەوێت، کە ڕستەکە لە شێوەی پرسدایە، ئەگەر زیاتر لە ڕستەکان ڕامێنین، دەبینین پەیڤێکی پرسکردن لە هەر یەک لەم ڕستانەدا هەیە، کە بەهۆی ئەو پەیڤەوە پرسیارمان کردووە.

١. لەڕستەکانی ژمارە (١) دا، پەیڤی پرسی (چەند) بە کارهاتووە، کە لەگەڵ ناوێکدا بە کارهاتووەو پرسی پێ لەو ناوە دەکرێت، دیارە

لـه وەڵامیشـدا دەبیَ پەیڤەکی وا بەکاربێت، کـە وەسـفی ناوەکـە بکاتو ببێتـە تەواوکـەر بۆی. وەک ئـەوەی لـە وەڵامـی پرسـیاری یەکەمدا بڵێین (دوو جۆرە پێنووسـم کڕی) کـە دیارە لێرەدا هاوەڵنـاوی (دوو) وەڵامـی پەیڤـی پرسـی (چەنـد)ە، کەواتـە پەیڤەکـە هاوەڵنـاوی پرسـە. ڕسـتەی دووەمیـش هـەر ب ڤـی ئاوایـە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا پەیڤی (کام) لە پێش ناوی ئەستێرە بەکارهاتووە، کـە دیـارە پرسـیار لـە ئەسـتێرەی جـوان دەکات، بۆیـە وەڵامەکـەی بـە (ئـەم .... ە) یـە، کـە هاوەڵنـاوی نیشـانەیە و نـاوە دیارخراوەکـەش دەچێتـە نێوانیـان و پەیڤـی کام وەک هاوەڵنـاوی پـرس بەکارهاتـووە.

٣. لـە ڕسـتەی سـێیەمدا هـەر بڤی ئاوایی، پەیڤا پرسـیَ (کیـژان ــ کی ژوان) دگـەل (ژن) یـا هاتییە ب کار ئینانیَ، داکو لناڤ کۆمەڵـەکا ژنـان، ویَ ژنـیَ دەسـت نیشـان بکـەت، کـو ژ هەمـی ژنێـن دی درێژتـرە، هـەر ژبـەر هندێیـە ئـەڤ پەیڤـە ژی ب هاوەڵنـاویَ پـرس دهێتـە ناسـین.

٤. لـە ڕستەکانی ژمـارە (٤)دا، پەیڤەکانـی (کوو، چۆن، چاوان) لـە واتـادا یەکنو لەگـەڵ نـاودا بەکارهاتـوون، لەنـاو ئەوانەشـدا پەیڤـی (چۆن) لـە دوو شـێوەدا بەکارهاتـووە بـەم جـۆرە:

ئـ - لە پێش ناودا هاتووە،

کە لەو بارەدا پێویستی بە (ی) ئامرازی دانە پاڵ نییە.

ب- لە دوای ناودا،

کە پێویستی بە ئامرازی دانەپاڵی (ی، ا، یَ، ێد، ێت، ێن) هەیە، ئەگـەر وەڵامـی پرسـیارەکانیش بدەینـەوە، دەبیَ لـە وەڵامەکاندا وەسـفی نـاوەکان بکەیـن، بۆیـە پەیڤەکانـی (کـوو، چـۆن، چـاوان) بـە هاوەڵنـاوی پـرس دێنـە هەژمـاردن.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا بەهۆی پەیڤی پرسی (چ ... یک)، پرسیارمان لەو قوتابییە کردووە، کە لە هەموو وانەکان دەردەچێت، مەبەستیش ناوی قوتابییەکە نییە، بەڵکو سیفەتەکەیەتی، بۆیە لە وەڵامدا دەڵێین: (قوتابی زیرەک، یان قوتابی هشیار... هتد) لە هەموو وانەکان دەردەچێت، کەواتە یەپڤی پرسی ناوبراو، لە شێوەی هاوەڵناوی پرس بەکار هاتووە.

٦. لە هەر دوو ڕستەی ژمارە (٦)دا پەیڤی پرسمان لە شێوەی (چەندەم، چەندەمین) بەکارهێناوە، کە پرسی پێ لە ڕیزبەندی دەکەین، لە وەڵامیاندا ژمارەیەک لە شێوەی هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستندا بەکاردەهێنین، بۆیە دەبنە هاوەڵناوی پرس.

**دەستور:**

١. هاوەڵناوی پرس، پەیڤەکی پرسە، کە وەسفی ناوێک دەکات لە شێوەی پرسدا.

٢. ئەگەر هاوەڵناوی پرس لە پێش ناوەکە هات پێویستی بە ئامرازی دانەپاڵ نابێت وەک:

کام سوار گەهشتە جیێ؟

کیش هەسپ ژ هەمیا خێراترە؟

چەند هەڤاڵت هەن؟

چ ئەسپێک ڕەسەنە؟

ئەگەر لە پاش ناوەکە هات، ئەو کاتە ئامرازی دانەپاڵی دەوێت وەک:

هوین ل گوڤەندەکا چاوان پشکداربوون؟ (ا) ئامرازی دانەپاڵە.

ئەوان لە ڕۆژێکی چۆن سەفەریان کرد؟ (ی) ئامرازی دانە پاڵە.

٣. ئەو پەیڤێن پرسیێین کو دبنە هاوەڵناوی پرس ئەڤەنە:

ئـ- کام، کامە، کیهان، کیهە، کیژان، کیش.

ب- چەند (چقاس).

پ- چۆن، چاوان، کوو، چلۆن.

ت- چ ... یێک.

٤. ئەرکی هاوەڵناوی پرس لە ڕستەدا

ئـ . دەبێتە دیارخەری ناو. وەک:

١. کراسێکی چۆنت کڕی؟

٢. کام قوتابی بە یەکەم دەرچوو؟

ب. دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواو

- خواردنەکە چۆن بوو

## ڕاهێنانی (١)

پەیڤی (چۆن) لە دوو ڕستەدا بەکاربێنە، بەو مەرجەی لە یەکەمیاندا تەواوکەری کارێکی ناتەواو بێت و لە دووەمیاندا دیارخەری ناوبێت.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانە شیبکەوە:

١. چەند ڕۆژنامە لە کوردستان دەردەچن؟

٢. کیهان کچ خوشکا تەیە؟

## هاوەڵکاری پرس

**ئەم ڕستانە بخوێنەوە:**

/١

ئـ- قوتابییان لە ڕۆژی نمایشی وەرزشیدا چۆن دەڕۆیشتن؟

ب- ئەڤ کورە چاوا دنڤیسیت؟

پ- منداڵەکان کو دانیشتبوون؟

/٢

ئـ- سۆران دوێنێ چەند پێکەنی؟

ب- پەروین ل نک تە چەند ڕوونیشت؟

/٣

ئـ- کەی کەنگر پەیدا دەبێت؟

ب- کەنگی ئەم دێ چینە زۆزانان؟

پ- کەینێ زەنگی یەکەم وانە لێدەدرێت؟

/٤

ئـ- هاوینان لە کوێ دەنوون؟

ب- لەزگین ل کیڤە ڕوونیشتبوو؟

## خستنەڕوو:

لـە وانەکانـی پێشـوودا باسـی ئەوەمـان کـرد، کـە هەندێـک لـە پەیڤەکانی پرس دەبنە (جێناوی پرس، هاوەڵناوی پرس)، بۆیە پێویستە ئـەوەش ڕوونبکەینـەوە، کـە هەندێک جار پەیڤەکانی پرس بۆیان هەیە ببنـە هاوەڵـکاری پرسـیش، بـۆ نمونـە:

١. ئەگەر تەماشای ڕستەکانی (ئـ ، ب، پ)ی ژمارە (١) بکەین دەبینین پەیڤەکانـی پرسـی (چـۆن، چـاوا، کـوو) بەکارهاتـوونو هەرسـێکیان پرسـیاریان پـێ لـە چۆنیەتـی ڕوودانـی کاری ڕسـتەکان دەکرێـت، بـۆ نمونە لەڕستەی (ئـ)دا پەیڤی (چۆن) پرسیاری پێ لە چۆنیەتی ڕۆیشتنی قوتابییـان کـراوە، بۆیـە کـە وەڵامـی پرسـیارەکە دەدەینـەوە، پێویسـتە هاوەڵکارێک بەکاربێنین، بگونجێت لەگەڵ چۆنیەتی ڕۆیشـتنەکە، واتـە بڵێین (باش دەڕۆیشـتن) یان (خراپ دەڕۆیشـتن)، لێرەدا هـەردوو پەیڤی (باشو خراپ) هاوەڵکاری چۆنیەتین، چونکە وەسفی چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕسـتەکە دەکـەنو سـنورێک بـۆ ڕوودانـی کارەکـە دادەنێـن، ئـەم دوو پەیڤـەش لـە وەڵامـی پەیڤی پرسـی (چـۆن) بەکارهاتـوون، کەواتـە لێرەدا (چـۆن) دەبێتـە هاوەڵکاری پـرس، هـەر بـەو جـۆرەش پەیڤەکانـی (چـاوا، کـوو) ئـەو ژی هـەر دبنـە هاوەڵـکاری پـرس.

٢. دیسـا ژی لـە هـەردوو ڕسـتەی (ئـ ، ب)ی ژمـارە (٢)دا، پەیڤی پرسـی (چەنـد) لـە دوو ڕسـتەدا لـە شـێوەی پـرس بەکارهاتـووە، بـۆ پرسـین لـە ڕادەی ڕوودانـی هـەردوو کاری (پێکەنـیو ڕونیشـت)، لـە وەڵامیشـدا پێویسـتە هاوەڵکارێکی گونجاو بەکاربهێنین، وەک ئـەوەی بڵێین (سـۆران دوێنـێ زۆر پێکەنـی)، یـان (پەروین ل نـک مـن پیچـەک ڕوونیشـت)، کـە

هـەردوو پەیڤی (زۆر، پیچـەک) هاوەڵکاری چەندینو لـە وەڵامـی پەیڤی پرسـی (چەنـد) بەکارهاتـوونو وەسـفی ڕادەی ڕوودانـی کارەکـە دەکـەن، بۆیـە دەبنـە هاوەڵکاری چەنـدیو پەیڤی (چەند)یش دەبێتـە هاوەڵکاری پـرس.

٣. ئـەم جـارەش لـە ڕسـتەکانی (ئـ ، ب، پ)ی ژمـارە (٣)دا، پەیڤەکانـی پرسـی (کـەی، گەنگـی، کەینـێ) بـۆ پرسـیارکردن لـە کاتـی ڕوودانـی کاری ڕسـتەکان بەکارهاتـوونو لـە وەڵامـدا پێویسـتە هاوەڵکارێکی کات بەکاربهێنیـن، وەک ئـەوەی لـە وەڵامـی پرسـیاری (ب)دا بڵێیـن (ئـەم هاڤینـێ دێ چینـە زۆزانـان)، کـە دیـارە پەیڤی (هاڤینـێ ـ هاوینـێ) هاوەڵـکاری کاتـەو وەڵامـی پەیڤی پرسـی (کەنگـی) پێدراوەتـەوە، بۆیـە ئـەو پەیڤـە پرسـانە دەبنـە هاوەڵکاری پـرس.

٤. هـەر بـەو جۆرەش لـە ڕسـتەکانی (ئـ ، ب)ی ژمـارە (٤)دا هـەر دوو پەیڤی پرسـی (لـە کـوێ، ل کیڤـە) بـۆ پرسـیارکردن، لـە جـێو شـوێنی ڕوودانـی کارەکـە دەپرسـن، بۆیـە ئـەو ژی دبنـە هاوەڵکارێ پـرس.

## دەستور:

١. هاوەڵکاری پرس:

پەیڤێکە لە شێوەی پرسدا، وەسفی کارێک دەکات و سنورێک بۆ ڕوودانی کارەکە دادەنێت‌و دەبێتە تەواوکەریشی.

٢. ئەو پەیڤێن پرسیێ،

کە دبنە هاوەڵکاری پرس ئەڤەنە؟

ئـ- (چەند) لە ئەندازەی ڕوودانی کارەکە دەپرسێت.

ب- (چۆن، چاوا، کوو): لە چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەپرسن.

پ- (کەی، کەنگی، کەینێ): لەکاتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەپرسن.

ت- (لە کوێ، ل کیڤە): لە شوێنی ڕوودانی کارەکە دەپرسن.

### ڕاهێنانی (١)

پەیڤی (چۆن) لەدوو ڕستەدا بەکاربێنە، بەو مەرجەی لە ڕستەی یەکەمیاندا هاوەڵناوی پرس‌و لە دووەمیاندا هاوەڵکاری پرس بێت.

### ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. جیاوازی لە نێوان هاوەڵناوی پرس‌و هاوەڵکاری پرس‌و جێناوی پرسدا چییە؟

٢. دوو ڕستە بە دوو هاوەڵکاری پرس بهێنەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

پەیڤە هێل بەژێر داهاتووەکان لەم ڕستەو دێڕە هۆنراوانەدا شلۆڤەبکە:

١. گرفتاری شەوی ئەگریجەتم، کوا ڕۆژی رووت قوربان؟
مەتۆرێنە دڵم توخوا، تەماشا چەند پەرێشـــانە؟

(قانع)

٢. تە کێ ل خاندنگە هێ دیت؟
٣. وێ ئەڤ هۆزانە چاوا ژ بەر کرییە؟
٤. تۆ چیت؟ من کوردم نەتەوەی کوردم
خۆ ترسنۆک نیت؟ حاشا نەبەردم
چی تۆی لەناو برد؟ دوو دڵیو نیفاق
چۆن ڕزگار ئەبی هەر بە ئیتیفاق
٥. گەلۆ، ئەڤە چەند ساڵە؟
ژینا مە تیــژو تـــاڵە.

# ڕستەی لێکدراو

١. نازداریّ فراڤین لێناو شەرمینیّ ماڵ پاقژکر.

٢. دیّ چیرۆکیّ خوینم پاشی دێنڤم.

٣. نانم خوارد، پاشان نامەکەم نووسی ئینجا نووستم.

٤. خوناو مامۆستایە بەڵام ئالان ئەندازیارە.

## خستنەڕوو:

خوێندوومانە، کە ڕستەی سادە واتایەکی تەواوی هەیە، لە (بکەرو کارێک) یان (نیهادو کاری ناتەواو) پێکدێتو یەک کاری تێدایە، جا کارەکە (تەواو- ناتەواو)بێت.

دەبێت بزانین ئەو ڕستانەی، کە لە ئاخاڤتندا دەردەبڕێن، هەمیشە سادە نین، واتە مەرج نییە یەک کاری تێدا هەبێت، ڕستەی وا هەیە بە (دوو کار یان پتر) واتاکەی پێکدێت، ئینجا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە ئەگەر لە ڕستەکانی سەرەوە وردبینەوە دەبینین:

١. ڕستەی یەکەم لە دوو ڕستەی سادەی سەربەخۆ پێکهاتووە، ڕستەی (نازداریّ فراڤین لێنا)و ڕستەی (شەرمینیّ مال پاقژکر). ئەم دوو ڕستەیە هەر چەندە لە واتادا سەربەخۆن، بەڵام پەیوەندی لە نێوان هەردووکیاندا هەیە، کە بە یاریدەی ئامرازی (و)ی لێکدەر، کە سەر بە هیچیان نییە هەردوو ڕستەکەی بە یەکەوە بەستووە، بۆیە بە هەردووکیان بەیەکەوە دەگوترێت (ڕستەی لێکدراو).

٢. ڕستەی دووەم لە دوو ڕستەی سادەی سەربەخۆ پێکهاتووە،

ڕستەی (دێ چیرۆکێ خوینم)و ڕستەی (دێنڤم) ئەم دوو ڕستەیە هەر چەندە لە واتادا سەربەخۆن، بەڵام پەیوەندییەک لە نێوانیاندا هەیەو کە بە یاریدەی ئامرازی (پاشی)ی لێکدەر، کە سەر بە هیچیان نییە بە یەکەوە بەستراون، بۆیە بە هەردووکیان بە یەکەوە دەگوترێت (ڕستەی لێکدراو).

٣. ڕستەی سێیەم لە سێ ڕستەی سەربەخۆ پێکهاتووە، ڕستەی (نانم خوارد)و ڕستەی (نامەکەم نووسی)و ڕستەی (نووستم) ئەم سێ ڕستەیە هەر چەندە لە واتادا سەربەخۆن، بەڵام پەیوەندییەک لە نێوان هەر سێکیاندا هەیە، کە یەکەمو دووەمیان بە یاریدەی ئامرازی (پاشان)ی لێکدەر، کە سەر بە هیچیان نییە بە یەکەوە بەستراون. هەروەها ڕستەی دووەمو سێیەمیش بە یاریدەی ئامرازی (ئینجا) ی لێکدەر دراونەتە پاڵ یەکتر، بۆیە بەیەکەوە بەم سێ ڕستەیە دەگوترێت (ڕستەی لێکدراو).

٤. ڕستەی چوارەم لە دوو ڕستەی سادەی سەربەخۆ پێکهاتووە، ڕستەی (خوناو مامۆستایە)و ڕستەی (ئالان ئەندازیارە).

ئەم دوو ڕستەیە هەر چەندە لە واتادا سەربەخۆن، بەڵام پەیوەندییەک لە نێوانیاندا هەیە، کە بەیاریدەی ئامرازی (بەڵام)ی لێکدەر، کە سەر بە هیچیان نییە بە یەکەوە بەستراون، بۆیە بەم دوو ڕستە بەیەکەوە دەگۆترێت (ڕستەی لێکدراو).

**دەستور:**

ڕستەی لێکدراو

ئەو ڕستەیەیە، کە لە دوو ڕستەی سەربەخۆی سادە یان پتر پێکدێت، پەیوەندییەک لە نێوانیاندا هەیەو بە یاریدەی (ئامرازی لێکدەر) دەدرێنە پاڵ یەکتر.

(ئامرازی لێکدەر) سەر بە هیچ ڕستەیەکی سادەی ناو ڕستە لێکدراوەکە نییە، لە ڕستەی لێکدراودا چەند کار هەبێت ئەوەندە ڕستەی سادەی تێدایە.

زۆربەی ئەو ئامرازە لێکدارانەی، کە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنرێن ئەمانەن:
(و، ئینجا، ڤێجا، بەڵام، لێ، پاشان، پاشی، چونکە، یان، یاخود، نەوەک، بەڵکو، کەچی، تا، تاکو، هەتا، هەتاکو، ... هتد).

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستە سادانە بە ئامرازی لێکدەر بگۆڕە بۆ ڕستەی لێکدراو:

١. شڤانی پەز چەراند، ئاف نەدا.
٢. نامەیەکێ بنڤیسە، بۆ زنارێ بهنێرە.
٣. هاوڕێ سواری ترۆمبێلەکە بوو، چوو بۆ هەولێر، چوو بۆ دهۆک.
٤. ئەم کوڕە زیرەکە، ئەو کوڕە تەمەڵە.
٥. برینێن خەنجەران ساخ دبن، برنیێن خەبەران ساخ نابن.
٦. یان برۆ، یان دەرگاکە پێوەدە.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ئامرازانەی خوارەوە ڕستەی لێکدراو پێک بهێنە:

(پاشی، کەچی، ئینجا، دوایی).

## ڕاهێنانی (٣)

هەر یەکە لەم ڕستە لێکدراوانەی خوارەوە بکە بە ڕستەی سادە:

١. شێرکۆ چوو بۆ لای چەتۆ، بەڵام چەتۆ لە ماڵ نەبوو.

٢. هەڤالێد من نەهاتن، چونکە بەفر باری بوو.

٣. دلشێری داستانا مەمو زینێ خواندو نامەیەک نڤیسی پاشی نڤست.

٤. ڕزگار هەڵبەستەکە لەبەردەکاتو پەخشانەکە دەنووسێتەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. نازداری فراڤینێ لێنا و شەرمینی ماڵ باقژ کر. (و) ئامرازی:

(پەیوەندی / لێکدەر / دانەپاڵ)ە

٢. یان برۆ یان دەرگاکە پێوەدە. (یان) :

(جێناوە / ئامرازی پەیوەندییە / ئامرازی لێکدەرە)

٣. دێ چیرۆکی خوێنم پاشی دێنڤم. (پاشی) ئامرازی :

(پەیوەندی / لێکدەر / دانەپاڵ)ە

## ڕاهێنانی (٥)

ئەم ڕستانە شیبکەوە:

١. نەمامەکەم چاند، بەڵام تۆوەکەم هەڵگرت.

٢. زەنگەکە لێدرا، ئینجا قوتابییەکان چوونە ژوورەوە.

# ئامرازی پەیوەندی

ئـ/

١. كاروان دەچێت بۆ زاخۆ.

٢. بەختيار لە قوتابخانە دەخوێنێت.

٣. سيڤ ژ دارێ وەرين.

٤. نەسرين تا ڕەواندزێ چوو.

٥. سەرهەنگ دەچێتە ئاكرێ.

ب/

١. تە نامە ژبۆ وان نڤيسييە.

٢. ترێ هەتاكو پاييزێ دەمێنێت.

٣. كاوە لەگەڵ برادەرەكانی ڕاوەستاوە.

٤. هەژار دگەل مە دژيت.

٥. نازەنين بەرەو قوتابخانە هات.

## خستنەڕوو:

### یەکەم:

ئەگەر سەيری ڕستەكانی بەشی (ئـ) بكەين، دەبينين لە هەر ڕستەيەكدا ئامرازی پەيوەندی هەيەو كەوتۆتە پێش ناوێك يان جێناوێك بۆ پيشاندنی پەيوەندی نێوان ئەو ناوە يان ئەو جێناوە لەگەڵ ناوێكی تری ڕستەكە، وەك:

١. لە ڕستەی یەکەمدا (بۆ) ئامرازی پەیوەندییە، پەیوەندی نێوان ناوی کاروانو زاخۆی پیشانداوە، کە کاروان دەچێت بۆ زاخۆ نەوەک بۆ شوێنێکی تر.

٢. لە ڕستەی دووەمدا (لە- دا) ئامرازی پەیوەندییە، پەیوەندی نێوان ناوی بەختیارو قوتابخانەی پیشانداوە، کە بەختیار لە قوتابخانەدا دەخوێنێت، نەوەک لە جێگەیەکی تردا.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا (ژ- ێ) ئامرازی پەیوەندییە، چونکە پەیوەندی نێوان سێڤو داری پیشانداوە، کە سێڤ لە داری وەریوە، نەوەک لە شتێکی تر.

٤. لە ڕستەی چوارەمدا (تا- ێ) ئامرازی پەیوەندییە، چونکە پەیوەندی نێوان ناوی نەسرینو ڕەواندزی پێشانداوە، کە نەسرین تا ڕەواندزێ چووە نەوەک زیاتر.

٥. لەڕستەی پێنجەمدا (ە) ئامرازی پەیوەندییە، کە پەیوەندی نێوان ناوی سەرهەنگو ئاکرێی پیشانداوە، کە سەرهەنگ دەچێتە ئاکرێ نەوەک شوێنێکی تر.

دووەم:

هەروەها ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین، دەبینین کە لەهەر ڕستەیەکدا ئامرازی پەیوەندی هەیە بەم شێوەی خوارەوە.

١- لەڕستەی یەکەمدا (ژبۆ) ئامرازی پەیوەندییە، کە پەیوەندی نێوان ناوی نامەو جێناوی (وان) پیشانداوە، کە نامە بۆ (وان) نووسراوە نەوەک بۆ یەکێکی تر.

٢- لە ڕستەی دووەمدا (هەتاكو) ئامرازی پەیوەندییە، كە پەیوەندی لەنێوان ناوی (ترێ) و (پاییز) پیشانداوە، كە ترێ هەتاكو پاییزێ دەمینێت نەوەک وەرزێكی تر.

٣- لە ڕستەی سێیەمدا (لەگەڵ) ئامرازی پەیوەندییە، كە پەیوەندی نێوان ناوی (كاوە)و برادەرەكانی پیشانداوە، كە كاوە لەگەڵ برادەرەكانی ڕاوەستاوە، نەوەک لەگەڵ كەسانی تر.

٤- لە ڕستەی چوارەمدا (دگەل) ئامرازی پەیوەندییە، كە پەیوەندی نێوان ناوی (هەژار)و جێناوی (مە)ی پیشانداوە، كە هەژار دگەل مە دژیت نەوەک دگەل یەكێكی تر.

٥- لە ڕستەی پێنجەمدا (بەرەو) ئامرازی پەیوەندییە، كە پەیوەندی نێوان ناوی (نازەنین)و قوتابخانەی پیشانداوە، كە نازەنین بەرەو قوتابخانە هات نەوەک شوێنێكی تر.

**دەستور:**

## ئامرازی پەیوەندی:

ئەو وشەیەیە، كە لە ڕستەدا لە پێش ناوێک یان جێناوێک دێت بۆ پیشاندانی پەیوەندی نێوان ئەو ناوە یان ئەو جێناوە لەگەڵ ناوێكی تری هەمان ڕستە.

## ئامرازەكانی پەیوەندی:

(بۆ، لە- دا، لە- را، لە- ەوە، ل – دا، ژ- ێ، ژ- را، د- دا، بە- دا، بە- ەوە، ب- دا، تا- ێ، وەک، بێ، ە، لەبۆ، ژبۆ- ڕا، هەتا، هەتاكو، هەتا وەكو، بەبێ، لەگەڵ، دگەل، بەرەو، بەرەڤ، بەر ب).

## ڕاهێنانی (١)

پێنج ڕستە بهێنەوە کە ئامرازی پەیوەندییان تێدا بێت.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستەی خوارەوەدا

تا ناو دارستانەکە چووین.

ئـ . وشەی (تا) شیبکەوە:

ب. وشـەی (دارسـتانەکە) چ جۆرە ناوێکـە لـە ڕووی داڕشـتنییەوە؟ چۆن پێکهاتووە؟

پ. بکەری ڕستەکە دیاربکە.

ج. لەکاری (چوو) کاری ڕانەبوردوو، داخوازی دروست بکە.

چ. وشەی (تا) وەکو ئامرازی لێکدەر لە ڕستەدا بەکاربهێنە.

# ئامرازی دانەپاڵ

١. گوڵی باخەکە جوانە.

٢. برادەری ئێوە دڵسۆزە.

٣. ڕۆمانە نوێیەکەم خوێندەوە.

٤. بابێ ئازادی پێشمەرگەیە.

٥. دایکا نازداری پزیشکە.

٦. ل چیاییێت کوردستانێ بەفر دباریت.

٧. هەڤالێن مە هاتن.

٨. مرۆڤێد زیرەک سەر دکەڤن.

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری ئەم ڕستانە بکەین، دەبینین لە هەر ڕستەیەکدا ئامرازی دانەپاڵ هەیە، کە ناوێکی داوەتە پاڵ ناوێکی تر، یان جێناوێکی داوەتە پاڵ ناوێک، یان هاوەڵناوێکی داوەتە پاڵ ناوێک، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. لە ڕستەی یەکەمدا ئامرازی (ی) لە نێوان ناوی گوڵو باخدا، ئامرازی دانەپاڵە چونکە ناوی (باخەکە)ی داوەتە پاڵ ناوی (گوڵ).

٢. لە ڕستەی دووەمدا ئامرازی (ی) لە نێوان ناوی (برادەر)و جێناوی (ئێوە)، ئامرازی دانەپاڵە چونکە جێناوی (ئێوە) ی داوەتە پاڵ ناوی برادەر.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا (ە) لە نێوان (ڕۆمان و نوێیەکە) ئامرازی

دانەپاڵـە، چونکـە هاوەڵنـاوی (نـوێ)، کـە دیارخـەرە داوەتەپـاڵ نـاوی رۆمـان، کـە دیارخـراوە.

٤. لـە ڕسـتەی چوارەمـدا ئامـرازی (ێ) لەنێـوان نـاوی (بـاب)و نـاوی (ئـازاد)، ئامـرازی دانـە پاڵـە چونکـە نـاوی (ئـازاد)ی داوەتـە پـاڵ نـاوی (بـاب).

٥. لـە ڕستەی پێنجەمدا ئامرازی (ا) لەنێوان نـاوی (دایک)و نـاوی نازدار، ئامرازی دانـە پاڵـە چونکـە نـاوی (نـازدار)ی داوەتـە پاڵ نـاوی (دایک).

٦. لـە ڕسـتەی شەشـەمدا ئامـرازی (ێت) لەنێـوان نـاوی (چیـا)و نـاوی (کوردسـتان)، ئامـرازی دانـە پاڵـە، چونکـە نـاوی (کوردسـتان)ی داوەتـە پـاڵ نـاوی (چیـا) وەک ناوێکـی کـۆ.

٧. لە ڕسـتەی حەوتەمـدا ئامـرازی (ێن) لەنێـوان نـاوی هەڤـاڵو جێنـاوی (مـە)، ئامـرازی دانـە پاڵـە، چونکـە جێنـاوی (مـە)ی وەک جێناوێـک داوەتـە پـاڵ نـاوی (هەڤـاڵ).

٨. لـە ڕسـتەی هەشـتەمدا ئامـرازی (ێـد) لەنێـوان نـاوی (مـرۆڤ )و هاوەڵنـاوی زیـرەک، ئامـرازی دانـە پاڵـە، چونکـە هاوەڵنـاوی (زیـرەک)ی داوەتـە پـاڵ نـاوی (مـرۆڤ).

**دەستور:**

ئامرازی دانەپاڵ

وشـەیەکە، کـە (ناوێـک، جێناوێـک، هاوەڵناوێـک) دادەتـە پـاڵ ناوێکـی تـر.

١. ئامرازی (ی) نـاوی نێر و مێی تـاک و کۆ دەداتـە پاڵ ناوێکی تر، یان جێناوێک یـا هاوەڵناوێکی چۆنی لە شێوە زاری کرمانجی خوارووداا.

٢. ئامـرازی (ە) هاوەڵنـاوی چۆنییـە دەداتـە پـاڵ نـاوی (تـاک و کـۆی ناسـراو) بـەڵام نیشـانەی کـۆ و ناسـراوی دەچێتـە دوای هاوەڵناوەکـە.

٣. ئامـرازی (ێ) ناوێـک یـان جێناوێـک یـان هاوەڵناوێـک دەداتـە پـاڵ نـاوی تاکـی نێـر لـە شـێوە زاری کرمانجـی سـەروودا.

٤. ئامـرازی (ا) ناوێک یان جێناوێک یان هاوەڵناوێک دەداتە پاڵ نـاوی تاکی مێ لـە شێوە زاری کرمانجی سـەروودا.

٥. ئامـرازی (ێـت- ێـد- ێـن) ناوێـک یـان جێناوێـک یـان هاوەڵناوێـک دەداتـە پاڵ ناوێکی کۆی نێر و مێ لـە شێوە زاری کرمانجی سـەروودا.

## ڕاهێنانی (١)

پێنج ڕستە بهێنەوە ئامرازی دانە پاڵی تێدا بێت، سێیان بۆ ناوی تاک و دووانیان بۆ ناوی کۆ بن.

## ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. کێ، لە هەموو ڕستەیەکدا:

(هاوەڵناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / جێناوی پرس)ە

٢. کەی، لە هەموو ڕستەیەکدا:

(هاوەڵناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / جێناوی پرس)ە

٣. کوڕی کێ لە پێناو کوردستان شەهیدبوو؟ (کێ) جێناوی پرسە ئەرکی: (بەرکارە / نیهادە / دیارخەری ناوە)

٤. کەینێ زەنگی یەکەم لێدەدات؟ (کەینێ)

(هاوەڵناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / جێناوی پرس)ە

٥. هاوەڵناوی پرس لە ڕستەدا دەبێتە دیارخەری:

(هاوەڵکار / جێناوی پرس / ناو)

٦. کێهان کچ خوشکا تەیە؟ (کێهان) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)

٧. چ قوتابییە لە تاقیکردنەوە لە هەموو وانەکان دەرنەچووە؟ ( چ ):

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٨. کام لەمانە هاوەڵکاری پرسە بۆ هۆکاری ڕودانی کار:

(چەند / چۆن / ژبەرچی و لەبەرچی)

٩. کێ نەخۆش کەوت؟ (کێ) ئەرکی:

(بەرکارە / بکەرە / نیهادە / گوزارە)

١٠. هاوڕێکەت کەسێکی چۆنە؟ (چۆن) تەواوکەری :

(کاری ناتەواوە / کاری تەواوە / هیچیان)

١١. تۆ پۆلی چەندەمیت؟ (چەندەم) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

١٢. چ کەوتە خوارەوە؟ ( چ ) ئەرکی:

(بەرکارە / بکەرە / نیهادە / گوزارە)

١٣. دوێنێ کێت بینی؟ (کێ) ئەرکی:

(بەرکارە / تەواوکەری بەیاریدە / نیهادە / گوزارە)

١٤. ئەڤ پەرتوکێ ژ کێ وەرگرت؟ (کێ) ئەرکی:

(بەرکارە / تەواوکەری بەیاریدە / نیهادە / بکەرە)

١٥. هاوینان لە کوێ دەنوون؟ (لە کوێ) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

١٦. ناوت چییە؟ ( چی ) جێناوی پرسە، ئەرکی:

(نیهادە / بکەرە / تەواوکەری کاری ناتەواوە)

١٧. شانیا لکیڤە ڕوونیشت بوو؟ (لەکوێ و لکیڤە) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ن

١٨. منداڵەکە چەند نووست؟ (چەند)

(هاوەڵناوی پرس / جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس)ە

١٩. بۆ پرسیارکردن لە کەسێک بەکاردێت:

(کێ / چۆن / چەند / کوێ)

٢٠. کامه به یەکەم دەرچوو؟ (کامه) ئەرکی بکەرە :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٢١. ئەڤ کورە چاڤا دنڤیسیێت؟ (چاڤا) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٢٢. چۆن دیارییەکت بۆ ئاری برد؟ (چۆن) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٢٣. کێ بیینرا؟ (کێ) ئەرکی :

(بکەرە / جێگری بکەر / دیارخەری ناو)

٢٤. ئەمە پێنوسی کێیە؟ (کێ) ئەرکی :

(نیهادە / دیارخەری ناو / تەواوکەری کاری ناتەواوە)

٢٥. شیرین کچی کێیە؟ (کێ) ئەرکی :

(تەواوکەری کاری ناتەواوە / هەردووکیان / دیارخەری ناو)

٢٦. چەند پێنوست کڕی؟ (چەند) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٢٧. ئۆتۆمۆبێلێکی چۆنت کڕی؟ (چۆن) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٢٨. منداڵەکان کوو دانیشتبوون؟ ( کوو ) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٢٩. چەند رۆژنامە ل کوردستانێ دەردکەڤن؟ ( چەند ) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٣٠. کێ زیرەکە؟ (کێ) ئەرکی :

(بکەرە / نیهادە / دیارخەری ناو)

٣١. مرۆڤی چۆنت خۆشدەوێ؟ (چۆن) :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)ە

٣٢. (کێ / کامە و کێهان / چۆن) بۆ جیاکردنەوەی کەسێک یان شتێک لە نێو کۆمەڵە کەسێک یان کۆمەڵە شتێک

٣٣. کیژان ژن ژ هەمیا بەرزترە؟ (کیژان) چییە :

(جێناوی پرس / هاوەڵکاری پرس / هاوەڵناوی پرس)

## ڕاهێنانی (٣)

لەم ڕستەیەی خوارەوەدا:

دەستکەوتەکانی ڕاپەڕین دەپارێزین

ئ- (ی) لەنێوان وشەی دەستکەوتەکانو ڕاپەڕین چییە؟

ب- بکەری ڕستەکە دیاربکە، بۆچی خراوەتە ئەوێ؟

پ- وشەی دەستکەوتەکان شیبکەوە.

ت- دەپارێزین بە پێی کات چ جۆرە کارێکە؟ چۆن دروستکراوە؟

ج- لە کاری دەپارێزین کاری ڕابردووی ڕاگەیاندن بەپێی دەمەکان دروستبکە.

ئـ :

# بەشی ئەدەب

## وەرزی یەکەم

**ئەدەب:**

وشـەی ئـەدەب، کـە (وێژە) شـی پێدەگوترێت، بـە دوو واتـای جیاواز بەکاردێـت.

یەکەم:

واتایەکی تایبەتییە، کە بـە مەبەست لێی ئـەو ئاخافتنو گوتـراوە نایابانـەن، کـە خۆشـیو شـادی دەخەنـە دڵـی گوهـدارو خوێنەرانـەوە، جـا گوتـراوەکان هۆنـراوە بـن یـا پەخشـان، هەڵبەسـتی نایـابو هۆزانـی بـەرزو چیرۆکـی خـۆشو گوتـاری نـاوازەو گەلـەک بەشـی دیکـە دەکەونـە ژێـر ئـەم پێناسـەیەوە، چونکـە دێنـە خوێندنـەوەو گوهـ لێبوون، چەشـەو خۆشـیەکی هونەرییـان لێدێتـە وەرگرتـن.

دووەم:

واتـای گشـتی ئـەدەب: ئـەو بەرهەمـەی مێشـکی مـرۆڤ دەگرێتەوە، کـە لەشـێوەی ئاخافتنـدا خـۆی دەنوێنێتو لـە لاپـەڕەی کتێبەکانـدا دێـتە نڤیسـین، لـەم بارەیـەوە کتێبـی ڕێزمـانو کتێبـی وەرزشو سروشـتزانی ئەدەبێکـن بـە واتـای گشـتی، چونکـە بەرهەمـی هەمـە چەشـنی مێشـکی مـرۆڤ دەنوێنن، کـە مـەرج نییـە لـە کاتـی خوێندنەوەیانـدا ئـەو خۆشـیو چەشـەیان لێوەربگیرێـت، کـە لـە ئەدەبـی تایبەتیـدا وەردەگیرێـت.

**ئەدەب لەسەر چوار ڕەگەز دامەزراوە کە ئەمانەن:-**

١- سۆز: کار دەکاتە سەر ئەندێشەو دڵو وا دەکات، کە بە ئارەزووویەکی خۆشەویستانە بشنێتەوە.

٢- بیر: بیری ئەدیبو نووسەر ڕەگەزی بنەڕەتی بەرهەمی ئەدەبییە.

٣- ئەندێشە: ئەویش خەیاڵێکی تیژ تێپەڕی پەنهانییە لە دڵدا، بەبێ ئەندێشە ئیشی هونەرە ئاشکراکانی ئەدەب دەوەستێ.

٤- واتا: واتای مەبەستەکە ڕووندەکاتەوەو لەڕووی وشەو ڕستەوە بە جوانی دایدەڕێژێتەوە تا سۆزو ئەندێشەکە ڕوونبکاتەوە.

**مێژووی ئەدەب:**

مێژووی ئەدەب بەشێکە لە مێژووی گشتی نەتەوە و بە تێکڕایی دەکەوێتە بەر بەرنامەکانی مێژوو، لە دیرۆکو مێژووی گشتیدا، هەندێک ڕاستی هەنو باسدەکرێن، کە سەر بە سەردەمی ڕابردوونو لەگەڵ ئێستادا پەیوەندییان براوە.

بەڵام لە مێژووی ئەدەبدا، هۆنراوەو پەخشان هەر کاریگەرنو زیندوون، چونکە توانای وروژاندنی بیرو سۆزیان هەیە.

مێژووی ئەدەبی هەر نەتەوەیەکیش لە کاتێک پەیدا دەبێت، کە ئەو نەتەوەیە سامانێکی ئەدەبی لا پەیدا ببێت، کە شایانی نووسینەوەو مێژوو بۆ دانان بێت.

مێژووی ئەدەب زانستێکە باس لە چۆنیەتی زمانو ئەو هۆنراوەو پەخشانە جوانانە دەکات کە بۆمان بەجێماون، بەرزیو نزمییان دەردەخات، لە کاروبارو ژیانی هۆزانڤانو نووسەرو ئەدیبانیش دەدوێت و بەرهەمەکانیشیان هەڵدەسەنگێنێت.

## ڕەخنەی ئەدەبی:

دیارە هەر لەو دەمەی خەڵک گوێیان لە هۆنراوەی شاعیران یا وتارو شتی تری ئەدەبی بووە، هەندێکیان بیروڕای خۆیانیان دەربڕیوە، ستایشی بەرهەمەکانیان کردووە، یانیش کەمو کورتییان پیشانداون، کە ئەوەیان یەکەم شێوەی ڕەخنەی ئەدەبی بووە، لە پاشان وردە وردە پەرەی پێدراوەو پێشکەوتووە، تا وایلێهاتووە ببێتە خاوەنی چەند ڕێو شوێنێکی تایبەتی بە شێوەیەکی وا، کە لە دواییدا بووبێتە هونەرێکی نایابی سەربەخۆی ئەدەبی.

دیارە هەر لەگەڵ پەیدا بوونی ئەدەبدا، ڕەخنە پەیدا بووە و هاوشانبوون، چونکە شاعیرو هۆزانڤانە کۆنەکانی نەتەوەکان هەر خۆشیان ڕەخنەگر بوون، بۆ نمونە (ئەرستۆڤان) یەکەم ڕەخنەگری یۆنانی، شاعیر بووەو شانۆنامەیەکی دوورودرێژی بە ناوی (بۆقەکان) نووسیوە و تەرخانیکردووە بۆ ڕەخنەگرتن لە هەر سێ شاعیری تراژیدی یۆنان (سۆفۆکلیس)و (یۆروپیدس)و (ئەسیخیلۆس)، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین، کە ڕەخنەگرانی بەرایی شاعیر بوونە.

سەرەتای ڕەخنە لە ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەمی زایینیو لەم بوارەدا ( ئەحمەدی خانی) پێشەنگ بووە، هەروەها (حاجی قادری کۆی) لە ڕەخنەدا جێ پەنجەی دیارە. ڕەخنەی ئەدەبیش لەو بنەما هونەری و بیریانە دەکۆڵێتەوە، کە دەقی ئەدەبیان لێ بنیاتدەنرێت و بە شێوەیەکی زانستیانە لە بەرهەمی ئەدەبی دەکۆڵێتەوە.

## دابەشکردنی ئەدەب:

ئەدەب دابەشدەکرێت بۆ هۆنراوە و پەخشان.

یەکـەم: هۆنـراوە ئـەو ئاخەوتـن و نووسـینەیە، کـە بیـر و ئەندێشـەی تێدایـە و سـۆز دەجولێنـێ و واتایەکـی هەیـە.

دووەم: پەخشـان ئەو ئاخافتنو گوتراوەیە، کە کێشو سـەروا بەربەسـتی نـاکات، بەڵکو تەنیا هـەر بـە نووسین بەربەست دەبێتو زیاتر پشت بـە بیرکردنەوەی وردەوە دەبەستێت.

**جۆر و مەبەستەکانی هۆنراوە :**

زانیمـان کـە هۆنـراوە کۆنترین جـۆری ئەدەبە و ئەگـەر لێکۆڵینەوە لـە بەرهەمـی ئەدەبـی جیهـان بکەیـن، دەبینیـن کۆنتریـن پاشـماوەی ئەدەبی مـرۆڤ هۆنراوەیـە، ئەوەتـا لـە یۆنانـدا هۆنراوەکانـی (هۆمیرۆس) دەکەونـە پێش هەمـوو جۆرەکانـی ئـەدەب. لـە ئەدەبـی عەرەبیشـدا بـەر لـە هاتنـی ئیسـلام، هۆنـراوە لـە کـۆڕو کۆمەڵەکانـدا گوتـراوە، لـە کاتێکدا پەخشـان زۆر دەگمـەنو کەمبـووە. ئـەم دیاردەیـە لـە ئەدەبـی کوردیـدا ئاشـکراترە، چونکـە هۆنراوەکانـی (بابـا تاهیـری هەمەدانـی٩٣٧ - ١٠١٠) کۆنترین بەرهەمـی ئەدەبـی کوردیمانـن، کـە تـا ئێسـتا مابێتەوە، پەخشـانی کوردیـش زۆر دوای ئەمـە پەیـدا بـووە.

## گرنگترین جۆرەکانی هۆنراوە:

### ١. هۆنراوەی گۆرانی:

ئەم جۆرەیان زمانی ویژدانەو شان بەشانی گۆرانی ڕۆیشتووە، دیارە گۆرانیو لەلای هەموو نەتەوەیەک باوەو کەس لێی بێبەش نییە، بۆ نمونە نالی دەڵێ:

**چاوی من دەم دەم دەڕێژێ ئاوی سافو خوێنی گەش**
**تا بڵێن دەریای عومانە دوڕو مەرجانی هەیە**

(بۆ لەبەرکردنە)

### ٢. هۆنراوەی شانۆیی

ئەم جۆرە وەکو دەمەتەقێی نێوان دوو کەسی لێدێتو دیمەنێکی بینراویشی لەگەڵدا دەبێت، چونکە هۆنراوەی سەر شانۆیە، هۆنراوەی شانۆیش دوو جۆرە، بەزمەسات (کومیدیا)و کارەسات (تراژیدیا). نمونەشی لە ئەدەبی کوردیدا ئەم هۆنراوەی هەژاری موکریانییە:

**• مام بایز ڕۆژباش**
**– (علیک السلام)**
**• ئەمە یانی چی؟**
**– جیرانی مەلام**
**• نەم دی دوێنێو پێر**
**– بەخوا چوومە شار**
**• چیت فرۆشت بەخێر؟**
**– یەک دووبارە دار**
**• نرخەکەی چۆن بوو؟**
**– بۆتە چوار قیمەت.**

(بۆ لەبەرکردنە)

### ٣. هۆنراوەی فێرکردن:

ئـەم جۆرەیـان سـۆزو ئەندێشـەی بێهێـزەو داڕشـتنەکەی بـەرز نییـە، لەبـەر ئـەوە بـە تـەواوی ناکەوێتـە بـەر واتـای هۆنـراوەوە، هـەر بـۆ مەبەسـتی فێرکـردن بەکاردێت، وەک ئـەم هۆنراوەیـەی (بێکـەس)

شـتێکی بێ خوێنو گیان
ئەفـڕێت، ئەچێتە ئاسمان
هەڵـدەگرێ گەلێ ئینسان
دوو بـاڵی پێوەیە جوان
ناویــان نــاوە تەیــارە
زۆر مـەحـکـەمو بەکـارە
لــە شــەڕا مســیبەتـە
لـە ئاشـتیيا نیـعمەتـە
لـە سایەی حیرفەتو فەن
شـتی وا دروسـت ئەکەن

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## مەبەستەکانی هۆنراوەی کوردی

### ١. نیشتمانپەروەری:

یەکێکە لە گرنگترین مەبەستەکانی هۆنراوەی کوردی، ئەم جۆرەیان لەگەڵ سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی‌و نیشتمانپەروەری پەیدا بووە، ڕابەری ئەم مەبەستە (ئەحمەدی خانی) و ئینجا (حاجی قادری کۆیی) و شاعیرانی ترن. ئەم جۆرە هۆنراوانە سۆزێکی نەتەوە پەروەری و نیشتمانپەروەری دەخەنە دڵو دەروونی وەرگرەوە.

**خانی لە پێشەکی مەمو زیندا دەڵێت:**

قەت مومکنە ئەڤ ژ چەرخی لەولەب
تالیع ب بتن ژ بۆ مە کەوکەب؟
بەختێ مە ژ بۆ مەڕا ببت یار
جارەک ب بتن ژ خابی هشیار
ڕابت ژ مە ژی جهان پەناهەک
پەیدا ب بتن مە پادشاهەک
ئیدی هونەرا مە بێتە دانین
قەدری قەلەما مە بێتە زانین

(دوو دێر بۆ لەبەرکردنە)

## ٢. دڵداری:

یەکێکە لە مەبەستە هەرە بڵندو جوانەکانی هۆنراوەی کوردیەو لوتکەی هەستی مرۆڤ بەرامبەر بە خۆشەویستەکەی پیشاندەدات نمونەشی ئەم هۆنراوەیەی تایەر بەگی جافە:

**تـــا بەکەی قوربان بناڵم من بە ئێشو دەردەوە**

**دەس بە ئەژنۆ قوڕ بەسەر دایم بە ڕەنگی زەردەوە**

**ڕۆژی ئەوەل بوو کە زانیـــم من ئەبێ دێوانە بم**

**عاشقـــی تۆ نەوعی مەجنوون وا بە کێوو هەردەوە**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## ٣. شانازیکردن:

ئەم جۆرەیان پەیوەستە بە شانازیکردنی شاعیر بەخۆی و وڵات و دەوروبەری. وەک ئەم نمونەی (حاجی قادری کۆیی):

**لە گاوانو شوانی کوردەکـــان یەک**

**بەسە، بۆ لەشکری سەد کەڕە لەک**

**فیدای گاوانو شوانتان حاتەمی تەی**

**بە قوربانی سەپانتان ئالی بەرەمەک**

**مریشـــکی ئێوە صەییادی شەهێنە**

**لەکن عەنقا فروجە حاجی لەقـــلەق**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

### ٤. لاوانەوە:

ئـەم جـۆرە هۆنراوەیـە تایبەتـە بـە باسـکردنی لـە دەسـتدانی ئازیزان و کۆستکەوتن. (پیرەمێرد) لە لاوانـەوەی بۆ (مسـتەفا خۆشـناو) و (محمـد قودسـی)، کـە دوو لـە چـوار ئەفسـەرە شـەهیدەکەی سـاڵی (١٩٤٧ز) بـوون. دەڵێـت:

**دیسان وا کۆستی نوێمان کەوتەوە**
**گەڕی گەردوونە کوردی گـــرتەوە**
**ئەم دوو دار تەرمە دوو نەڕە شێرە**
**زنجیریان پچڕان گەینەوە ئێـــرە**
**لەڕێی ئێمەدا گیانیان فیداکـــرد**
**ناوی بڵندیان وا بۆخۆیان بـــرد**
**ئەو پەتەی لە ملی ئەمانە خـــرا**
**ئەوانی خنکان بەڵام پەت پچـــڕا**

(دوو دێر بۆ لەبەرکردنە)

### ٥. داشۆرین:

بـۆ مەبەسـتی نزمکـردن و دەرخسـتنی خـەوش و لایەنـی کەموکوڕییـە، نمونـەی هۆنـراوەی داشـۆرین، ئـەم پارچەیـەی شـێخ ڕەزای تاڵەبانییـە.

**هەزار ئەفسونو جادووی پێوە ئاوێزانە ئەم ڕیشـــە**
**عیلاجی گەر ببـــێ یا گوزە یا گوێزانە ئەم ڕیشـــە**
**بە تەحریکی تەلێکی سەد هەزار نەفسی بە کوشتن دا**
**ڕەئیسی حیلەکاران، شای قومار بازانە ئەم ڕیشـــە**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

### ٦. وەسف:

مەبەست لێی وەسفکردنی سروشتو مرۆڤ و شتی جوانە، لەم لایەوە دەتوانین بڵێین هۆنراوە هەر هەمووی وەسفە، بەڵام لە هۆنراوەی کوردیدا ئەم مەبەستە زیاتر بەلای وەسفکردنی سروشتی جوانی کوردستاندا دەشکێتەوە، بۆ نمونە (مەولەوی) لە وەسفی بەهاردا دەڵێ:

نـــــــــازک تەدارەک فەسلی وەهاران
زەریف ئارایش هەردەو کۆهســـــــاران
گوڵ چون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشـــان
وەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشـــان

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| زەریف ئارایش | : | جوان ڕازاوەتەوە |
| چـون | : | وەکو |
| وەفراوان | : | بەفراوان ، بەفراو |
| دیدەی من | : | چاوی من |

## فۆلكلۆر چییە؟

### وشەی فۆلكلۆر:

فۆلكلـۆر وشـەیەكی لێكـدراوە لـە هـەر دوو وشـەی ( folk )بـە مانـای خەڵـك یـان گـەل و (lore) بـە مانـای (چیـرۆك، ژیـری، هونـەر، زانسـت) ی ئینگلیزییـەوە هاتـووە، واتـە سـامان یـا كەلەپـوری خەڵـك، بـەم پێیـە فۆلكلـۆر بـە هەمـوو ئـەو سامانو كەلەپورە كۆنانـە دەڵێن، كـە بەدرێژایـی مێژوو دەسـتكردو بەرهەمـی خەڵـك بوونو ماونەتـەوە، وەك: پاشـماوەكانی جلوبەرگـی میللـی كـۆنو ئێسـتا، رایـەخو هۆیەكانـی تێدا خـواردن (قـاپ، كاسـە، كەوچـك... هتـد)و گەلێـك چەشـنی پیشەسـازیو نەقشو نیگارو جۆری خواردەمەنیو زۆر شـتی تـر، كـە شـەقلی تایبەتـی كۆنـی میللەتێـك لـە بەرهەمێكـی دەسـتكرد یـا بەرهەمـی بیریـدا بهێڵێتـەوە.

هەندێـك جـار لەنـاو فۆلكلـۆردا بەشـی بیـر، یـا بەشـی ئـەدەب جیـا دەكەنـەوەو پێـی دەڵێـن (بەرهەمـی ئـەدەبی فۆلكلـۆری) ئـەو بەرهەمـەش ئەوەیـە، كـە بەسـەر زارەوەیـە، دەمـاودەمو پشتاوپشـت، كوڕ لـە باوكەوە، منداڵ لـە دایكـەوە دەیبیسـتێتو دەمێنێتـەوە، لەبـەر ئەمـە ئـەدەبی فۆلكلـۆر بـە بەرهەمـی تاقـە كەسـێك دانانرێـت، بەڵكـو دەدرێتـە پـاڵ هەمـوو میللـەت، فۆلكلـۆر بەرهەمێكـە، كـە هەمـوو گـەل خولقاندوویەتـی، بەرهەمـی فۆلكلـۆری، شـێوەیەكی سـادەی وای هەیـە كـە هەمـوو گـەل تێیبـگاتو شـەقلی تایبەتـی ئـەو گەلـە یـان ئـەو زەمـانو دەورەی خـۆی پێوەیـە.

## گرنگترین جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی

### ١. ئەفسانە:

ئەفسانە بەرهەمی ئەو کاتەیە، کە مرۆڤ بێدەسەڵات بووەو ڕووبەڕووی سروشت وەستاوە، بەرهەمی سەرەتای ژیانی مرۆڤایەتییە، خەیاڵ بەشێوەیەکی فراوان باڵا دەستە.

### ٢. هەقایەت:

هەقایەت یا سەرگوزەشتە: بەشێکی گەورەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردییە و بەرەو پێشچوونێکی ئەفسانەیە، لە ڕووی ڕوخسارو داڕشتنەوە لەو دەچێت، بەڵام کەرستەی ئەفسانە زیاتر نوقمی خەیاڵ بووە، کەچی کەرەستەی هەقایەت لە ژیانەوە وەردەگیرێت.

### ٣. گۆرانی:

لە سەردەمێکی زۆر کۆنی ژیانی مرۆڤایەتییەوە پەیدابووە، لە بارەی هۆکاری پەیدابوونی ئەم جۆرە فۆلکلۆرەوە دوو بۆچوون هەیە:

بۆچونی یەکەم هۆکارەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئیشی هەرەوەزیو کاری بە کۆمەڵی مرۆڤ. لە گۆرانی ئیشکردنیشدا وشەو ئاوازو دەنگ، لەگەڵ بزووتنەوەی ئەندامەکانی لەشدا تێکەڵ دەبنو چاکترین نمونەش گۆرانی دروێنەکردنە.

بۆچونی دووەم، دەیگەڕێنێتەوە بۆ لایەنی ئایینیو دەڵێت گۆرانی ئایینی کۆنترین جۆری گۆرانییە.

### ٤. گاڵتەو گەپ:

هەمیشە لەشێوەی چیرۆکێکی کورتدا دادەڕێژرێت، مەرج نییە قارەمانەکانی ئەم چیرۆکانە مرۆڤ بن، زۆرجار لەسەر زمانی (ئاژەڵو باڵندە) دەیگێڕنەوە. قارەمانی گاڵتەو گەپ، کەسێکی ڕاستەقینەی قسەخۆشو نوکتەبێژە، نمونەی ئەم جۆرە ئەدەبە فۆلکلۆرییەش چیرۆکەکانی (مەلای مەشور) ە.

### ٥. مەتەڵ:

مەتەڵ زیاتر بۆ کات بەسەربردن بەکاردێت، بەرهەمی سەرزاری خەڵکە، بەشێوەیەکی نادیارو تەماوی دەردەبڕێت، مەبەستەکەشی پێویستی بە ڕامانو بیرکردنەوەیە.

### ٦. یاری:

بریتییە لە پیشاندانی توانا و هێز و لێهاتوویی بەرامبەر کردارێک لە نێوان دوو کەس یان دوو لایەن ...هتد زیاتر بەمەبەستی بردنەوەو دۆڕاندن ئەنجامدەدرێت.

### ٧. داستان:

داستان بەرهەمێکە لە چیرۆک دەچێت، سەرگوزەشتەیەکی ڕوداو یان ڕاستەقینە دەگێڕێتەوە.

## تایبەتمەندییەکانی داستان:

١. چیرۆکی داستان گەلێک ڕووداوی ترسناکو سامناکی وای تێدایە، کە بەزۆری لە پاڵەوانێکی ناودار دەدوێت.

٢. زمانی چیرۆکی داستان، پتەوو بەهێزو شێواز جوانە.

٣. بەشی زۆری ڕوداو و بەسەرهاتەکانی ناو داستان، دەگمەنو نا ئاساییبن، کەسانی ناو داستانیش پاڵەوانی مەزنو بناف و دەنگن، جاری وا دەبێت هەندێک لە خواوەندەکان دەبنە پاڵەوانی داستانەکان.

## مێژووی داستان لە جیهاندا:

ئەگەر لەمێژووی داستانی جیهانی بدوێین پێویستە لە کۆنترین داستانەوە دەست پێبکەین کە تا ئێستا بەدەستمان گەیشتووە، ئینجا وردە وردە بە مێژوودا هەڵگەڕێین، تا دەگەینە سەردەمە تازەکان بەم جۆرە:

### ١. داستانی سۆمەری:

سۆمەرییەکان لە سێ هەزار ساڵەی پێش زایین بەولاوە لە خوارووی عیراقدا ژیاون و خاوەن شارستانییەت بوون، لەبەر ئەوە کەلەپورو میراتێکی زۆریان لەدوای خۆیاندا بەجێهیشتووە، پشکنینو گەڕان بەدوای پاشماوەکانیان، بووە هۆی دۆزینەوەی گەلێک داستانی سۆمەری، شلۆڤەکردنی جۆری نووسین لای سۆمەرییەکان سەرەتایەک بوو بۆ زانینی نهێنییەکانی ئەو داستانانەو بوو بە دەستپێک بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی داستانی جیهانی.

داستانی سۆمەری زیاتر لەشێوەی ئەفسانە دایە، قارەمانانی بەزۆری خواوەندەکانی سۆمەر بوون، وەک: (ئینلیلو ئانکیو ئۆتۆو دەموزی).

داستانی (گەلگامێش) یەکێکە لە بەناوبانگترین داستانێن سۆمەری، لەودا گەلگامێش بەدوای (نەمری)دا دەگەڕێت، کە یەکێکە لە سیفەتی خواوەندەکان، بەڵام ئەوەی ئەم داستانە لە داستانەکانی تری سۆمەریەکان جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە پاڵەوانی داستانەکە خواوەندێکی تەواو نەبووە، هەر لەبەر ئەوەشە بەدوای نەمریدا گەڕاوە، کە خواوەندەکان هەیان بووەو گەلێک قارەمانیو ئازایەتی لە پێناو ئەم مەبەستەدا نواندووە، بەڵام بە ئاکام نەگەیشتووە.

## ٢. داستانی گریگی یان یۆنانی:

کۆنترین نمونەی داستانی یۆنانی، (ئەلیادە) و (ئۆدیسا) ی هۆمیرۆسن، کە کۆنترین جۆری هۆنراوەن تا ئێستا گەیشتبێتە دەستمان و لە سەدەکانی نۆیەم و هەشتەمی پێش زاین نووسراون.

ئەلیادە باس لە ڕوداوەکانی ساڵی یەکەمی ئەو جەنگە خوێناوییە دەکات، کە لە نێوان گریکو تەڕوادەدا ڕوویداوەو دە ساڵی خایاندووە.

بە قسەی بێری (Bury)ی مێژوونووس، ڕوداوەکان دەبێت لە (١٩٩٠) پێش زایین ڕوویاندابێت، تەڕوادەو گریگ هەر لە کۆنەوە دژومنایەتیو دووبەرەکییان لە نێوان هەبووە، وا ڕێککەوت، کە پادشای تەڕوادە، (هێلین)ی ژنی پاشای ئەسپارتەی ڕفاندو ئەویش هانای بردە بەر گریگەکان، تەڕوادەکانیش داوای یارمەتییان لە میرەکانی

ئاسیای بچوک کرد، لەبەر ئەوە ماوەی دە ساڵ جەنگێکی خوێناوی لە نێوانیاندا ڕوویداو ئەنجامەکەشی خۆ بەدەستەوەدانی تەڕوادە بوو، پاڵەوانانی ئەم داستانە هەموویان مرۆڤی ئاسایی نەبوون، هەندێکیان نیمچە خواوەند بوونو ئەوانی تر خواوەندی ڕاستەقینە.

داستانی دووەمی هۆمیرۆس، کە (ئۆدیسا) یە، باس لە بەسەرهاتی یەک لە پاڵەوانەکانی گریگ دەکات کە ناوی (ئۆدیسیۆس) بوو، پاش خۆ بەدەستەوەدانی تەڕوادە، ئەڤ پاڵەوانە ڕێز لە دڵسۆزیو میهرەبانی (بنۆلۆپیا)ی خێزانی دەنێت، کە چۆن پاش چەند ساڵی بێ سەرو شوێن بوونی ئودیسیۆسی مێردی، هەر لەسەر دڵسۆزی خۆی مایەوە تا هاتەوە.

### ٣. داستانی هیندی:

هیندستان، وڵاتی ئەفسانەو داستانە، بۆیە لە ڕێڕەوی مێژووی داستانی جیهاندا، ئەم وڵاتە ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە، لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین لەو وڵاتەدا دوو داستان دهێنە دیتن، (مەهابەهاراتا) و (ڕامایانا). ئەم دوو داستانە چونکە لە کاتێکی درەنگدا پەیدا بوون، بۆیە شەقڵی تاکە کەسییان پێوە دیارە.

داستانی (مەها بەهاراتا)، کە لەلایەن (ویاس) دانراوە، باس لەو جەنگە درێژ خایەنە دەکات، کە لە نێوان خواوەندەکانو خێلی (ئاسۆرا)دا ڕوویدا، هەر لایەنێکیش سەرکردەو پێشەوای خۆی هەبوو، سەرکردەی ئاسۆرا کە ناوی (سۆکەر ئەچاریا) بوو، توانای زیندووکردنەوەی کوژراوانی جەنگی هەبوو، بۆیە خواوەندەکان زۆری لێدەترسانو هەوڵی ئەوەیان دەدا کە بیکەن بە دۆستی

خۆیان، داستانەکە پڕە لە باسی شەڕو شۆڕو پیلان گێڕان، هەر لەو داستانەداو لە زمانی (ویاس) هەندێک پەندو ئامۆژگاری دەگێڕنەوە وەک (هەر کەسێک بەرامبەر بە دوژمنکاریو دەستدرێژی دراوسێکەی، دان بەخۆیدا بگرێتو لێیخۆش بێت، ئەوا هەموو خەڵکی ئەم دنیایە دەکاتە بەندەو کۆیلەی خۆی).

### ٤. داستانی ڕۆمانی:

بە ناوبانگترین داستانی ڕۆمانی، داستانی ئەنیادەیە، کە (ڤێرجیل)ی شاعیری بەرزی ڕۆمانی دایناوە، سەردەمی دانانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یەکەمی پێش زایین، باس لە (ئینیاس) ی پاڵەوانی تەڕوادە دەکات، کە چۆن لەگەڵ گریکەکان کەوتووەتە جەنگو دوای خۆ بە دەستەوەدانی (تەڕوادە) باوکە پیرەکەی لە کۆڵی دەکاتو شارانو وڵاتانی پێدەگەڕێت تا بارو بارخانەی لە ئیتاڵیادا دەخاتو گوایە (ڕۆمۆلۆس)ی دامەزرێنەری شاری ڕۆما نەوەی ئەو بووە.

### ٥. داستانی ئێرانی:

بەناوبانگترین داستانی ئێرانی، داستانی (شانامە) یە، شانامە شاکاری شاعیری بەناوبانگی ئێرانی (فیردەوسی) یە، دانانی داستانەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی (دەیەم) ی زایینی، داستانەکە (شێست هەزار) دێرە هۆنراویە، باس لە مێژووی کۆنی ئێران دەکات، تا سەردەمی ئیسلامی لە سەدەی حەفتەمی زاییندا، ئەم داستانە بە گەورەترین سەرچاوەی زمانی فارسی دەهێنە دانان، باس لەو جەنگو

شـەڕو شـۆڕانە دەکات، کـە ئێرانیانـی کـۆن لـە سـەردەمی ساسـانیو غەزنەوییەکانـدا لەگـەڵ دوژمنەکانـی خۆیانـدا بەرپایانکـردووە، تـا هاتنـی ئایینـی ئیسـلام، کـە تیایـدا بـە گیانێکـی نیشـتمانپەروەریو نەتـەوە خوازییەوە، قارەمانیەتیو ئازایەتی جەنگاوەرانی ئێران دەگێڕێتەوە، وەک ڕۆسـتەمی زاڵو سـوهرابو زۆرانـی تـر، ئـەم داسـتانە سـەرچاوەیەکی گرنگـە بـۆ زانینـی مێـژووی کۆنـی ئێـران.

جگـە لـەو داسـتانە بنـاڤ و دەنگانـەی باسـمانکردن، ژمارەیـەک داسـتانی تازەتـر هـەن کـە دەگەڕێنـەوە بـۆ سـەدەکانی ناوەڕاسـت، وەک داستانی (سرودی تاریکی) کە داستانێکی کۆنی ئەڵمانییەو باس لە کارو کـردەوەی هـۆزە ئەڵمانییـەکان دەکات لـە سـەردەمی کۆنـدا، هۆنراوەکانـی ئـەم داسـتانە لەسـەدەی (دوازدەهـەم) ی زایینـدا کۆکرانـەوە، هەروەهـا داسـتانی (کۆمیدیـا)ی (دانتـی)، شـاعیری گـەورەی ئیتاڵیـا لـە سـەدەی چوارەمـی زایینـی، کـە یەکێکـە لـە شـاکارە ئەدەبییەکانـی سـەدەکانی ناوەڕاسـت.

داسـتان دیاردەیەکی مێژووییـە، لەبـەر ئـەوە لای هەمـوو میللەتـان وەک یـەک پـەرە ناسـێنێت، بەڵکـو لـە گەشـەکردنو پەرەسـەندنیاندا جیـاوازی هەیـە، هـەر ئەمـەش وا دەکات، کە لـە داسـتانی کوردیدا هەندێک دیمـەن هەبن، کە لەگـەڵ داستانی میللەتانی تـردا یەکی بخـات، هەروەهـا هەندێـک دیمەنـی تـری تێدا بێت کـە لـەو داسـتانانەی جیـا بکاتـەوە.

## داستانی ڕۆژهەڵات:

لەناو میللەتانی ڕۆژهەڵاتدا گەلێک داستانی هاوبەش هەن، ئەو داستانانە هاوبەشن چونکە:

١. بە چەند زمانێکی ڕۆژهەڵاتی هەن.

٢. لەناو چەند میللەتێکداو بەشێوەی جیاواز دێنە گێڕانەوە.

٣. هیچ یەک لە میللەتانی ڕۆژهەڵات ناتوانن بیانکەن بە مولکی تایبەتی خۆیان، با ڕووداوەکانی ناو داستانەکەش لە وڵاتی ئەو میللەتەدا ڕوویان دابێتو ناوی قارەمانەکانیشی سەر بەو میللەتە بن.

٤. لەناو هەر میللەتێکی ڕۆژهەڵاتدا، داستان مۆرکو شەقڵی ئەو میللەتەی پێوە دیارە کە دەیگێڕنەوە. بۆ نمونە داستانی (لەیلاو مەجنون)، شوێنەوارو ناوی سەر بەخاکو زمانی عەرەبن، بناغەکەشی هەر ئەو چیرۆکە فۆلکلۆریە عەرەبییەیە، کە لەناو عەرەبدا لەبارەی خۆشەویستی (لەیلا)و (قەیس)ەوە دەیگێڕنەوە، بەڵام ئەم داستانە لەناو کوردو فارسو ئازەرو گەلێک میللەتی دیکەی ڕۆژهەڵاتی باوەو بە جۆری جیا جیا دەیگێڕنەوە.

هەروەها داستانی (شیرینو فەرهاد) یا (شیرینو خەسرەو)، شوێنەوارەکەی لە کێوی (بێستون)ی خاکی کوردستانی ئێرانە، ناوی قارەمانەکانی کوردییە، بەڵام لە پاڵ کوردیدا، بە فارسیو بە تورکیو بە چەند زمانێکی تریش دهێتە ڤەگێران.

هەر بەم جۆرەش، چیرۆکەکانی ناو داستانی (شانامە)ی فیردەوسی و باسی قارەمانەکانی ئەو داستانەش، بەر لە دارشتنەوەکەی فیردەوسی لەناو میللەتانی ڕۆژهەڵاتدا بڵاوبوون، ئەوەندە هەیە فیردەوسی سەر لە نوێ لەشێوەی داستانی هۆنراوەدا دایرشتوەتەوەو گیانێکی فارسی پێبەخشیوە.

## له فۆلكلۆرەوە بۆ نووسین:

داستانەكان لە سەرەتادا بەرهەمی فۆلكلۆرین و لەلایەن خەڵكەوە بە سەر زاری گێردراونەتەوە و باسكراون، لە دوایدا لەلایەن شاعیر و نووسەران بە دەستكاری و چێژێكی زۆرەوە تۆماركراون. بۆ نمونە:

١. داستانی (لەیلاو مەجنون) ب زمانێن فارسیو توركیو كوردیو عەرەبی چەند جارەكو ژ لایێ چەند شاعیرەكی سەر بە چەند سەدەو سەردەمەكی ڤە هاتییە نقیساندن، نیزامی گەنجەوی بە فارسی، فزولی بەغدادی بە توركی، حارسی بەتلیسی بە كوردیو ئەحمەد شەوقی بە عەرەبی نووسیویانە.

٢. داستانا (شیرینو فەرهاد) یان (شیرینو خەسرەو) ژی، بە چەند زمانێكو چەند جارێكو لەلایەن چەند شاعیرێكەوە، لە چەند سەدەو سەردەمێكی جیاوازدا نووسراوەتەوە، نیزامی گەنجەوی بە فارسی، ئەمیر خەسرەوی دەلهەویو خانای قوبادی بە كوردی، نازم حیكمەتیش لە سەدەی بیستەمدا بە توركی.

ژ بلی هاوبەشیەتی لە داستاندا، وەرگێڕانیش هەیە، كە بریتییە لەوەی كە ئەو داستانەی بە یەكێك لە زمانەكانی ڕۆژهەڵات نوسراوەتەوە، شاعیرانی میللەتانی تری ڕۆژهەڵات، داستانە نووسراوەكە وەك خۆی وەردەگێڕنە سەر زمانی خۆیانو بەم جۆرە داستانەكە وای لێدێت، كە بە چەند زمانێك بهێتە گێڕانەوە، مۆركو شەقڵی ئەو میللەتە وەرناگرێت كە وەریان گێڕاوەتە سەر زمانەكەی.

ئەگەر داستانی ڕۆژهەڵات لە ئەدەبیاتی فۆلكلۆریدا شێوەی شیعرو بابەتی داستان یا (بەیت)ی كۆنیان هەبووبێتو دوایی بووبن

بـه داسـتانی نوسـراو، ئـەوا لـەم سـەدەیەدا هەموویـان دەسـتدەدەن بـۆ ئـەوەی ببنـە کەرەسـەی نووسـینی ڕۆمـان و شـانۆنامە (پیـەس)و سـیناریۆی تـازەی سـینەما، هەندێکیشـیان لـە قالبـی ئۆپێـرا یـان باڵێـدا گەیشـتنە سـەر شـانۆ گەورەکانـی جیهـان.

# داستانی کوردی

ئەگەر لەداستانی ڕۆژهەڵاتەوە بێینە سەر داستانی کوردی، دەبینین گەلێک داستانی هاوبەشمان لەگەڵ میللەتانی ڕۆژهەڵاتدا هەیەو گەلێک داستانیشمان هەیە کە بەشی کورد نەبێت، بەشی میللەتی تری پێوە نییە. واتە ئەگەر داستانەکە لەسەرەتادا ڕاستەقینەو ڕووداو بێت، ئەوا لە کوردستاندا ڕوویداوەو قارەمانەکانی کوردنو هەر بە زمانی کوردیش دەگێڕرێتەوە یا نوسراوەو لەناو کورددا بڵاوە، نمونەی ئەمانە داستانی (مەمی ئالان یان مەمو زین، خەجو سیامەند، خانزادو لەشکری، دوانزە سوارەی مەریوانو گەنج خەلیل)و هتد...

## بەشەکانی داستانی کوردی:

داستانی کوردی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەکرێت بە دوو جۆر:

**١. داستانی قارەمانی**

**٢. داستانی دڵداری**

## ١. داستانی قارەمانی:

قارەمانیو ئازایی دوو وشەی خۆشەویستن لەناو کورددا، ڕەنگە هەر ژیانی پڕ لە ئازارو ناخۆشیو بەربەرەکانیو خەباتی چەندین سەدەی مێژووی کۆنو تازە وای لە کورد کردبێت، کە حەز بە ئازایی بکات، نرخ بە پیاوی مەردو لە خۆبردوو بدات، قارەمان لای ئەو جێگەیەکی بڵندی هەبێت.

کە مردن هاتو خۆ لێپاراستنی نەبوو، مرۆڤ دەبێت بە ئازایی بمرێت، ئەم ڕاستییەی چەندین سەدە هەزاران جار هاتۆتەوە بەردەمی گەلێک ڕۆڵەی ئەو میللەتەو بەردەمی ئەو خەڵکەو وایکردووە کە ئەم ئازاییو لە خۆبوردنە ببێت بە بەشێک لە ژیانو لە خووڕەوشتی کورد، خۆ کە ئاوڕیشی داوەتەوەو چیای سەرکەشی لە پشت خۆیەوە بە پشتو پەنا دیوە، ترسی لە هیچ هێزێکی ترسێنەر نەماوە.

ئەم ڕاستییە، کە زۆرجار دووبارە بووەوە، وەک گوتمان دەبێت بە بەشێک لە ژیانو خووڕەوشت و بە یەکێک لە خاسیەتەکانی گەل، هەر لەبەر ئەوەش، کە ئەدەبیات فۆلکلۆر یان نووسراو بێت، ئاوێنەیەکی خاسیەتەکانی گەلن، لەبەر ئەوە تەواو ئەم ئازاییو قارەمانییە لە هەردوو ئەدەبیاتەکەدا (بەتایبەتی لە فۆلکلۆردا) ڕەنگیداوەتەوەو ئەو شێوەیەی وەرگرتووە، کە لێرەدا ناوی دەنێین (داستان)و لە پلەیەکی بەرەو ژووری خوێندندا دابەشیدەکەین بەسەر ئەو چەشنانەی داستاندا، کە لە ئەدەبیاتی گەلانی تردا هەنو لە هەر داستانێکی کوردیدا هەندێک دیمەنی یەکێک لەو چەشنانە دەبینین.

بەم جۆرە لەهەر ناوچەیەک چەند (لاوک و بەیت)ێک دێتە بەر گوێت، کە ناوی چەند پیاوی ئازاو بە مەردی شەهیدبوو، دەبنە سەر

ناو بۆی، بێجگە لەو هەموو داستانە کۆنانەی دەربارەی قارەمانانی خەیاڵی وەک (ڕۆستەمی زاڵو زۆرابو گیوو فەلامورز... هتد) لەناو کورد بڵاون، ناوی گەلێک قارەمانو شەهیدی ئەم چەند سەدەیەی دوایی سەر ناوی (لاوک)ی ئەم دواییەن بۆ نمونە:

(سوارۆ و خانزاد، شەریف هەمەوەند، عەزیزو تەکش دەچنە پاڵ (گەنج خەلیل و حاجی سادقی برۆ و ئەمینی پەریخان و خەلیل خۆشەوی و کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند. لەلاوکی ئەم سەدەیەدا ناوی (شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمود و قازی محەمەد و مەلا مستەفای بارزانی ) دەدرەوشێتەوە.

هەر وەک دیمەنی قارەمانو ئازایی تاقە کەسێک لە داستانی کوردیدا دیارەو ئەو کەسانە کوڕی میللەتنو وێنەی پیاوی نەبەردی ئەو نەتەوەن.

هەروەها گەلێک داستان هەن، ئازاییو بە جەرگیو قوربانی دانی بە کۆمەڵی خەڵک پیشاندەدەن، لە گەلێک داستاندا میللەت خۆی دیارەو تەواوی ئەم ڕاستییە ئەوەت بۆ دەردەخات، کە گەل خۆی مێژووی خۆی دەنووسێتو خۆی مێژووی سەرکەوتن نەخشە دەکێشێت.

بەربەرەکانی خەڵکی کوردستان بەرامبەر بە دوژمنانی، لە هەندێک داستاندا دیارە، لە داستانی (قەلای دمدم)دا هەر چەندە (خانی لەپ زێڕین) بوو بە قارەمانی ئەو داستانە، بەلام بەربەرەکانی هەموو خەڵکو هەموو جەنگاوەرانی ناو قەلاکە بوون بەدێری هەڵبەستی ئەو داستانە. داستانی (دوانزە سوارەی مەریوان)یش هەروەک (قەلای دمدم) وایە، ئەم قارەمانیەتیانە بە زۆری لە داستانی فۆلکلۆردا دەبینین.

بەڵام هەندێکیان هەر لەسەردەمی خۆیان بوون بە داستانی فۆلکلۆرو لە شیعری نووسراویشدا ڕەنگیان داوەتەوە، بۆ نمونە: ئازایی کوردان لە بەربەرەکانیی عوسمانییەکاندا لە پاڵ فۆلکلۆردا لە شیعری میلیی عەلی بەردەشانیدا بەتایبەتی لە بەیتی (ئەو ڕەحمان پاشای بەبە)دا دیارە، هەروەک ئەو بەربەرەکانییە لەزۆر هۆنراوەی (سالمی ساحێبقران)دا بەتایبەتی لە داستانی (عەزیز بەگی بابان)دا نەخشە کێشراوە، بێجگە لەمە باسی ئازایی‌و خۆ بەختکردن بووە بە بەشێکی گەورە لەهەموو ئەدەبیاتی کوردیدا، بەڵام هەموو ئەو بەرهەمانەی باسی ئازایی دەکەن (داستان)نین، بەڵکو لە جۆری ئەدەبی تریشدا، وەک هۆنراوەو چیرۆکو ڕۆمان وتاری ئەدەبی... هتد، ئازایی‌و قارەمانی‌و هەقپەرستی‌و نیشتمانپەروەری‌و خۆ بەختکردن ڕەنگیداوەتەوە.

نمونەیەک لە داستانی قارەمانی:

داستانی وامان هەن، کە قارەمانیەتی کۆمەڵو هەموو گەل پیشاندەدەن، ئەوەتا لە داستانی (سوارۆ)دا ئەم وێنەیە دیارە:

**لەشکرێک هەڵستاوە لەشکری شام و شیرازان**
**پێشی دەشتە سەر عەسکەران دوایی ڕادەوەستان**
**لەسەر چۆمی کافورو ئارازان**
**دەپەڕیەوە بە حوکمی کەڵەکو گەمیان**
**کیژ دەڵێ دەستی منو دامێن بێ**
**زینان بەرنە کن سەڕاجان**
**شیران بەرنە کن شیرگەران**
**تفەنگان بەرنە کن چەخماخسازان**

(دوو دێر بۆ لەبەرکردن)

## ٢. داستانی دڵداری:

شـاعیری گـەورەی کـورد ئەحمـەدی خانـی لـە (مـەمو زیـن)دا وەڵامـی ئـەم پرسیارە دەداتـەوە، ئایا بۆچـی (مـەمو زین)ی نووسیوە، یا بۆچ ئـەو داستانەی لەسـەر زاری خەڵکەوە، هێنایە نـاو دێری هەڵبەست، واتـە لـە داسـتانی فۆلکلۆرییـەوە، کـردی بـە شـابەرهەمی ئەدەبیاتـی نووسـراوی کـوردی.

خانـی لـە وەڵامـی ئـەو پرسـیارەدا چەنـد هۆیـەک پیشـاندەدات، یەکـێ لەوانـە ئەوەیـە، کـە دەڵێـت:

**هەم ئەهلی نەزەر نەبێن کو کرمانـج**
**عەشقی نەکرن ژ بۆ خوە ئارمانــج**
**تێکدا نە دتالبن نە مەتلـــــوب**
**ڤێـکرا نە موحیبن ئەو نە مەحبـوب**
**بـێ بەهرەنە ئەو ژ عەشقبــــازی**
**فاریــغ ژ حەقیقیو مەجــــازی**
**کرمـــانج نە پڕ دبێ کەمالـــــن**
**ئەمــــا د یەتیمو بێ مەجاڵــــن**
**بیلجــوملە نە جـاهیلو نەزانــــن**
**بەلکی د ســـەفیلو بێ خودانــــن**

(دوو دێڕ بۆ لەبەرکردن)

بەڵـێ، خانیی مـەزن ڕاسـتیکردووەو گەلێک باشیکردووە، خانـی لێرەدا لـەوە دەچێت وەڵامـی ئـەو کەسـانە بداتـەوە، کـە دوژمنـی کوردنو بـە درێژایـی مێـژووی خەباتـی کـورد دەمـی پڕوپاگەندەیـان، لـە کـورد کردۆتـەوە، کوردیان بـە خوێنڕێژ پیشـانداوەو وایان خسـتۆتە بـەر چاوی

خەڵک، کە گەلێکی دڕندە بێتو حەز بە خوێن ڕشتنو پیاو کوشتنو ناکۆکی بکاتو مانای یەک دڵیو خۆشەویستی نەزانێت.

خانی هەر وەک لە چەند دێڕێکی تری (مەمو زین)دا ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە کورد هەمیشە لە پێناوی پاراستنی خاکی خۆیدا کوژراوەو نەچۆتە سەر خاک و ماڵی کەس، لێرەدا ئەوەشمان پیشاندەدات، کە کورد زۆر باش مانای خۆشەویستی دەزانێو زۆر خۆشەویشتیو دڵداری قوڵ و زۆر چیرۆکی دڵداری لە کوردستاندا ڕوویداوە.

ئەگەر تەماشەیەکی بەرهەمی داستانی کوردیی بکەین، ڕاستی ئەم قسەیەی خانیمان بۆ دەردەکەوێت، گۆرانیبێژی کورد لەگەڵ داستانی قارەمانیدا سەدان چیرۆکی دڵداریو خۆشەویستی و لەسۆزی دڵداریو لە بیری بەرزی ئینسانی باسدەکات. لە بەیتی دڵداریی کوردیدا، دەروونی پڕ جۆشو خواستی جوانو نیاز پاکی ژنو پیاوی کورد ڕەنگدەداتەوە.

داستانی دڵداری لە هەموو جیهاندا، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا، سۆزێکی تایبەتیو هەستێکی قوڵو ڕاستگۆیی تێدایە، بەڵام داستانی دڵداریی کوردی، سەرەڕای سۆزو هەستو خۆشەویستیو وەفاداریو ڕاستگۆیی، جۆرێک لە ئازایەتیو فیداکاریش دەردەخات، بەڵکو لە زۆربەی ئەو داستانانەدا وێنەی خۆ بەختکردن لە ڕێگەی عەشقی پاکدا ژوور هەموو وێنەیەک دەکەوێتو دڵدار وەک فیداکارو شەهید پیشاندەدرێت، ئەمە لە داستانی (خەجو سیامەند)و (مەمو زین)دا زۆر ئاشکرایە.

لە داستانی دڵداریی کوردیدا، گەلێک ڕوخساری کۆمەڵایەتیو

خوورەوشتی کوردیش بە جوانی ڕەنگدەداتەوە، تەنانەت هەستی قووڵی زەحمەتکێشان‌و زۆرلێکراوان لەپشت پەردەی خۆشەویستی دڵدارییەوە دەبێتە هاواری نارەزایی‌و وەڕسی بەرامبەر بەو ڕەنجخۆرو زۆردارانەی خۆشەویستیشیان کردووە بە موڵکی دەستەی ڕەنجخۆرو دەیانەوێت پیرو هەژارو ڕەنجبەری لێ بێبەری بکەن.

لە داستانی دڵداریی کوردیدا، وێنەی پاکو ڕووی سورو ڕەنگینی ڕەنجبەران نەخشە دەکێشرێت.

بێگومان تا ئێستا بەشی زۆری داستانی کوردی (چ داستانی قارەمانی‌و چ داستانی دڵداری) تۆمار نەکراون، واتە هێشتا لە سنگی ئەو گۆرانیبێژانە دان، کە دەیانگێڕنەوەو هێشتا بە نووسراوەی چاپنەکراون، بەلام هەر بە بیستن، لەو داستانە کەمانەدا، کە چاپکراون، دەتوانین ئەو دیمەنانەی سەرەوە ببینین‌و داستانی وەک (خەجو سیامەند، لاس‌و خەزال، بارامو گوڵەندام، مێر و وەفا، حەسۆو زلخ، کەریمو ستی، ناسرو ماڵ ماڵ ...هتد) بکەین بە نمونە.

لێرەدا دەتوانین چەند نمونەیەک لە داستانی کوردی بخەینە ڕوو، بیانکەین بە بەڵگەی ئەو هەنگاوانەی داستانی کوردی، واتە هەنگاونان لە ئەدەبی فۆلکلۆرەوە بۆ ئەدەبیاتی نووسراو، هەروەها لەو باسانەی لە بەشی بەرنامەو خوێندنەوەی چەند ساڵەتاندا، دەیانبینین دەتوانن بەڵگەو نمونەی تەواوی ئەو دیاردەیە ببینین‌و بەهۆی ئەوانەوە لە بەشێکی گرنگی بەرهەمی سەرزارو نووسراوی کوردی بگەن، کە داستانە.

# شیرین و خەسرەو

داستانی شیرین‌و خەسرەو یەکێکە لەو داستانانەی کە لەناو گەلانی ڕۆژهەڵاتدا باوەو چەند شاعیرێک بە چەند زمانێکی ڕۆژهەڵاتی دایانڕشتووەو لە شێوەی فۆلکلۆرەوە دەرچووەو خراوەتە سەر شێوەی نووسین.

داستانەکە باس لە خۆشەویستییەکی بێوێنە دەکات، لە نێوان خەسرەوی کوڕی پەروێزی کوڕی نەوشێروان‌و شیرینی کچە شۆخی برازای (شەمیرا)ی شاژنی ناوچەی (مەهستان) لە دەوروبەری دەریاچەی (خەزەر). ئەو داستانە دڵدارییە ئەنجامێکی تراژیدییانەی ناخۆشی دەبێت، کە بە کوشتنی خەسرەوی پەروێز لەلایەن کوڕەکەی خۆی کۆتایی دێت‌و هەروەها بە خۆ کوشتنی شیرین بە کۆتا دەگات،

داستانەکە وێنەی خۆشەویستییەکی داوێن پاکانە دەخاتە ڕوو، هەر لە درێژەی چیرۆکەکەدا ناوی (فەرهاد)یش دێتە گۆڕێ، کە ئەویش دەکەوێتە داوی عیشقی شیرینەوە، هەر لە ئەنجامی ئەم عیشق‌و ئەڤینەوە مەرجی وای بەسەردا دەسەپێنن، کە لەتوانای مرۆڤدا نەبێت، وەک کونکردنی شاخی بێستون یا کێوی بێستون، کە دەکەوێتە ناوچەی قەسری شیرین لە کوردستانی ئێراندا.

ئەم داستانە بە زمانی کوردی- شێوەزاری گۆران- لە لایەن (خانای قوبادی‌و ئەمیر خەسرەوی دەلهەوی) نووسراوەتەوە، ئەم نمونەیە لەوەی خانای قوبادییە، کە شاکارێکی ئەدەبییەو بە (٥٥٢٦) دێر هۆنراوەتەوە.

شیرین جەی گوفتار دەروونش جۆشـــــــا
چۆن بەحری قولزم جەقین خرۆشـــــــا
پەنجەی ڕەنگین بەرد جەخیشم پەروێـــز
پارەکەرد یەخەش چون غونچەی نەوخێز
جە جامی نێرگز ئەو سیمین عـــــــوزار
بەرگی سەمەن کەرد بەلالەی بەهـــــــار
بە تووندی بەخیشم واتش بە شاپـــــوور
خوسرەو بێ شەرمەن هەم جە خودا دوور

(دوو دێر بۆلەبەرکردن)

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| جەی | : | ئەم، ل ئەڤ |
| گوفتار | : | گوتار، قسە، ئاخافتن |
| دەروونش | : | دەروونی، هەناوی، هناڤاوی، دەروووناو |
| جۆشا | : | هاتە جۆشان، کولا، کەلی |
| چون | : | وەکو |
| بەحری قولزم | : | دەریای سۆر |
| جەقین | : | لەڕق و کینە، ژ رقو کینەو بوغز |
| خرۆشا | : | هاتە خرۆشان |
| بەرد | : | برد، بر |
| جەخیشم | : | لەرقو تورەیی، ژ تورەیێ |

پارەکەرد : پارچەی کرد، پارکر.

ئەو سیمین عوزار : غونجەی تازە هەڵچوو

ئەو ڕوخسار سیمین : ئەو دەمو چاوە سپییەی وەکو زیو (وەکی زیڤ)

سەمەن : یاسەمین

وەهار : بەهار

واتش : گوتی، وی گۆت

بێ شەرمەن : بێ شەرمە، هیچ شەرم ل نک وی نینە.

جە خودا دروور : لەخودا دوور، دویرە ژ خودێ.

یاوە : بەلاڤە

گۆڕێ : مەیدان

داو : داڤ

شاخ : کێو، چیا

## مەمو زین

مەمو زین لە جیهانی ئەدەبیاتی کوردیدا هەمیشە لەگەڵ ناوی (ئەحمەدی خانی١٦٥٠ - ١٧٠٦)یەوە دێت، چونکە خانی ناوەرۆکی مەمو زینی لە (مەمی ئالان)ی فۆلکلۆری سەر زاری خەڵکەوە وەرگرتووە، پاش دەستکاریکردنی زۆری ناوەڕۆکەکەی.

خانی ڕووداوەکانی ناو داستانەکەی سەر لە نوێ بە زیاتر لە (٢٥٥٠) دێڕ هۆنراوە دارشتووەتەوە، کە دەتوانین بیکەین بە سێ بەش:

١. دیباجە، کە (١٨٨) بەیتە شیعرە، کە تیایدا باسی ئایینو فەلسەفەو تەسەوفو مەدحی پێغەمبەر دەکات، لەمانەش (١٧٣) بەیتی لەبارەی کوردایەتیو هۆی دانانی پەرتوکەکەیەتی بە زمانی کوردیو ئاشناکردنی خوێنەرە بە داستانەکە.

٢. ناوەرۆکی چیرۆکەکە، کە تیایدا باسی چیرۆکی ئەڤینی دەکاتو ڕووداوەکانی بە (١٩٤٨) بەیتە شیعر دەگێڕتەوە.

٣. کۆتایی کە بریتییە لە (٢٤٦) بەیت.

**ئەدگار و خاسیەتەکانی مەم و زینی خانی :**

١. وشەو پەیڤی بێگانەی بەتایبەتی (عەرەبی) زۆر تێدایە، کە ئەگەر خانی بیویستبایە دەیتوانی وشەی ڕەسەنی کوردی لە باتی زۆربەیان بەکاربهێنێت.

٢. زۆر پەیڤو وشەی لە بن زارەکانی تری کرمانجی سەروو تێدایە، کە وا دیارە خانی شارەزای هەموو لقە شێوەکانی کرمانجی سەروو بووەو سودیشی لە هەموویان وەرگرتووە، ئەمەش یەکیەتی زمانی ئەدەبی کرمانجی سەروو دەنوێنێت.

٣. مەمو زینی بە زمانێکی سادەو ئاسانو ڕەوان نووسیوە، تەنانەت ئەو خوێنەرەی، کە بە کرمانجی خوارووش دەدوێت، لێیتێدەگات، ئەمەش دەسەڵاتی ئەحمەدی خانی بەسەر هەموو شێوەکانی زمانی کوردی پیشاندەدات.

٤. سەروای شیعرەکانی (مەمو زین) لە بابەتی شیعری (مەسنەوی)یە، واتە دوو نیوە دێڕی هەر بەیتێکی لەسەر یەک سەروایە.

**خانی دەستکارییەکی زۆری ناوەڕۆکی داستانی فۆلکلۆری (مەمی ئالان) ی کردووە.**

١. خانی زۆر دیمەنی ئەفسانەی لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکە لاداوە.

٢. دەستکاری کاتو شوێنی ڕووداوەکانی کردووە، ئەوەتا چیرۆکەکەی لە ڕۆژی جەژنی نەورۆزدا دەستپێکردووە، شاری (جزیرێ)ی کردووە بە شوێنی ڕووداوەکان کە ماوەی ساڵێکیان خایاندووە، مەمو زینی بە جوتە کردووە بە خەڵکی جزیرێ.

٣. ناوی زۆربەی کەسانی داستانە فۆلکلۆرییەکەی گۆڕیوە، بۆ نمونە (میر ئەژین)ی کردووە بە (میر زێندین).

٤. داستانە فۆلکلۆرییەکەی خستووەتە سەر شێوەی داستانێکی شیعری، کە بەو جۆرە چووەتە ڕیزی ئەدەبیاتی کلاسیکی ڕۆژهەڵاتو، بووە بە لوتکەی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی.

**مەبەستی خانی لە دانانی داستانی مەمو زین دوو شتی سەرەکی بووە:**

١. بە هۆی مەمو زین بەرگری لە بیروباوەڕی سۆفیگەری و فەلسەفیو نەتەوەیی خۆی بکات، هەروەها مەمو زین بکات بە بەهانە بۆ دەربڕینی هەرچی لە دڵی دایە دەربارەی باری ژیانی کوردو پرسی نەتەوەیی:

**شەرحا غەمێ دل بکەم فەسانە**

**زین و مەمێ بکەم بەهانە**

٢. بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت، کە کوردیش خاوەنی میراتێکی گیانی ئەوتۆیە، کە هیچی لە میراتی نەتەوەکانی تر کەمتر نییە.

## ٨. پەندی پێشینان:

پەندی پێشنان بەرهەمێکی فۆلکلۆری زۆر کۆنی بابو باپیرانە، لە ئەنجامی ئەو بەسەرهاتو کارەساتانەی، کە لەهەموو ڕوویەکی ژیانەوە بە سەریان هاتووە پەندیان لێوەرگرتووەو بە چەند وشەو پەیڤێک یان چەند ڕستەیەکی کورتو ڕەوان، بە هەڵبەستێکی سادەو ئاسان کە زیرەکی خۆیانو یاسای ژیانی ئەو کاتەو لەوە پاش پیشاندەدات. ڕێکیان خستووەو بە یادگار بۆ نەوەی دوایی بەجێیان هێشتووە، کە لە ژیانیاندا لەسەری بڕۆنو بەو ڕەنگە ڕەفتاربکەن.

هەر نەتەوەیەک پەندی تایبەتی خۆی هەیە، کە دابو نەریتی ساڵەها ساڵی ڕۆلەکانی دەئاخنێتە ناو وشەکانیو... بە چەند پەیڤێکی ئاسانو ڕستەیەکی کورت سەربوردە و سەرگوزەشتەی چەندین کەس پیشاندەداتو ناوەرۆکی چەندین بەسەرهاتو ڕووداو ڕووندەکاتەوەو هەوێنی زۆر ئەزموون دەداتە دەست و بە ئامۆژگاریی گەش و پڕ سودو، واتای قول و پرشنگدار مەیدانێکی بەرینی ژیان ڕوناکدەکاتەوە.

کوردیش وەکو نەتەوەکانی تری جیهان پەندی واتادار و پڕ مەبەستی وای هەیە، کە چۆنیەتی ژیانی باب و باپیرانمان بەدەر دەخەن.

## تایبەتمەندییەکانی پەندی کوردی:

١. پەندی کوردی بەڵگەنامەو ئاوێنەی مێژووی هەزاران ساڵەی نەتەوەی کوردە.

٢. زۆربەی پەندە کورییەکان، پێوەرن بۆ پێوانی رادەی هۆشیاریو کارامەییو لێهاتوویی رۆڵەکانی نەتەوەی کورد.

٣. پەندی کوردی، لە زۆر باردا بووەتە رابەرو رێبەرو رێنیشاندەری خەڵکو چارەی باشی بۆ کێشەو ئاستەنگەکانی بەردەم ئەو خەڵکە دۆزیوەتەوە.

٤.هەموو کات پەندی کوردی خوو رەوشت و رەفتاری چاکی لەناو گەلدا چەسپاندووە و گیانی خۆشەویستی و هاوکاری و زبارە و یارمەتیدانی لە دڵیاندا چاندووە.

٥. بە گشتی پەندی کوردی وشە و پەیڤی رەسەنی کوردی دەگرێتە خۆی و لەم لایەنەوە دەتوانرێت سودێکی زۆری بۆ دارشتن و هەڵسەنگاندنی وشەی تازە و رەسەنی کوردی لێوەربگیرێت.

ئاشکرایە، کە ماوەیەکی زۆر درێژە خاکی کوردستان پارچە کراوەو گەلی کوردیش بەسەر چەند دەوڵەتێک دابەشکراوە، کە تا ئێستاش ئەو بارە ناسروشتییە هەر لە ئارادایە.

پێشتریش دوژمنانی یەکگرتنی کورد چاویان بریوەتە خێرو بێرو بەروبومو سەروسامانی خاکی بە پیتی کوردستانو... لەبەر زۆر ئەگەران رۆڵەکانی کوردیان لێک دوورخستۆتەوە، کە یەکەم ئەنجامی کارە نارەواکەیان پەیدابوونی چەند دیالیکتێکی زمانە، بەڵام خۆش بەختانە ئەم دیالێکتانە رەگو ریشە کوردییە رەسەنەکەیان هەر ماوە و بە پێچەوانەی خواستی ناحەزان زمانە شیرینەکەمان بەم

شێوازار پتر دەوڵەمەند بووەو فەرهەنگی وشەو زاراوەکان گەورەو فراوانتر بووە.

دیارە باپیرانمان بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی تەرازووی ژیان زۆر ژیرانە پەندیان دارشتوەو باری بەڵگەنەویستی سروشتیان خستۆتە ناو پەیڤەکانیانو بۆ ڕۆڵەکانیان جێهێشتووە، کە مەبەستیان پەروەردەکردنی نەوەی کورد بووە بە پاکی و مرۆڤ دۆستی بۆیە گوتویەتی:

**چ بچینی ئەو دەدووریيەوە**

کە لەڕواڵەتدا (گوێگرو خوێندەوار) ئەم پەندە بە بەڵگە نەویستێک دادەنێتو دیاریشە ئەوەی گەنم بچێنێت هەر گەنم دەدووردێتەوە نەک نیسکو نۆکو ماش، کەچی لە ناوەرۆکدا مەبەستی پەروەردەکردنی منداڵەو بەم چوار وشەیە پرۆگرامێکی گشتگیری پەروەردەو فێرکردنیان بۆ ڕووندەکاتەوە کە ئەوەندەی قوتابخانەیەک ڕۆڵی هەیە.

بەرامبەر ئەم پەندەش بۆ هەمان مەبەست پەندێکی ترمان هەیە کە دەڵێت:

**چ بکەنە کارێ ئەو دێ هێتە خارێ**

هەموومان دەزانین کە ژیانی باپیرە گەورەکانمان زۆر ئاسانو ئاسایی بووە، شێوەی خانووەکانیشیان بە پێی پێویستی ئەم ژیانە بووە، کەواتە هەر لەناو خانوودا کۆگایەکی دروستدەکرد کە خانە خانە بوو، ئەم خانانە لە ژێرەوە کون بوون، هەر خانەکیان بۆ جۆرە دانەوێڵەیەک تەرخاندەکرا، ناوی ئەم کۆگایە (کار) بوو.

ئیتر وەکو لێکدانەوەی پێشوومان، لە ڕواڵەتدا ئەو (کار)ەی

برنجی تێدەکرا هەر برنجەکە لە کونەکەی خوارەوەی دەهاتە خوارێ، کەچی لە رامانو مەبەستدا ئەم پەندە وەکو پەندەکەی پێشوو پەروەردەو فێرکردنە.

بۆ پەسندکردنی کاری باشو رێزگرتنی کاتی رەخساویش، باپیرانمان پێیان لەسەر ئەوە داگرتووە، کە پێویستە کاتو دەرفەت لە دەست خۆمان نەدەین، پێشوەخت ئامادەباشی بۆ بکەینو هەلو مەرجەکانی سەرکەوتنی کارەکانمان لەکاتی خۆیاندا ئامادەو دابینبکەین، ئەگینا ئیشو کارە ئاسانەکانمان گران دەبنو دەرفەتەکانیشی تێدەپەڕنو ناگەڕێنەوە، بۆیە گووتویانە:

گرێی دەستان مەدە بەر ددانان

ئەو گرێیا ب دەستان ڤەدبیت، ب ددانان ڤەنەکە

دیاریشە کورد لە سەرەتای ژیانییەوە ئاشتی خوازبووە، هێمن بووە، ژیانی تەبایی لەگەڵ یەکتریو کەسانی تر پێخۆشبووە، مافی کەسی نەخواردووە. ئەگەر راپەڕی بێتو شۆڕشی بەرپا کردبێت هەر لەپێناو وەرگرتنی مافە خوراوەکەی بووە، ریش سپیو هۆشمەندەکانی هەمیشە خەڵکیان هێورکردووتەوە و هەوڵی ئەوەیانداوە ناکۆکی لە نێوان خەڵکدا نەهێڵنو ئاگری مرۆڤە هەڵچووەکان دابمرکێنن.

ئەم پەندە جوانەیان لە مێشکی رۆڵەکانیان جێگیرکردووە:

خوێن بەخوێنی ناهێت شویشتن

کورد ویستویەتی بەری دەستی خۆی بخوات و ئارەقەی نەوچەوانی خۆی بخواتەوە، بۆیە هەمیشە رەنجی کاری خۆی پێخۆشتر بووە لە منەتی خەڵکی، لەپێناو نانو ژیاندا کارو خەباتی کردووەو ماندووبوونی نەزانیوە، بۆیە گوتوویانە:

**نانێ خۆ بخۆ ب ئاڤێ، منەتا خەلکی پاڤێ**

**گۆشتی ڕانی خۆت بخۆ ، منەتی قەساب هەڵمەگرە**

هەر بەم شێوەیە کورد مرۆڤی ئیشکەرو ڕەنجدەری خۆشویستووەو ڕێزیگرتووەو بە چاوێکی بەرز سەیری کارەکەی کردووە:

**دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە**

**کارکەری خۆ بە خۆشتڤیێ خەلکی**

هەروەها بابو باپیرانی کورد هەموو شتێکی ڕاستیان پێ باشبووە، واتە لە کارەکانیاندا دڵسۆزو لە گفتەکانیاندا ڕاستگۆ بووینەو، لەهیچ کاتو شوێنو هەڵوێستێکدا لە ڕاستییان لانەداوەو لە گۆتنی قسەی ڕاستو لە کردەوەی ڕاست نەترسانو دلێرانە بەرگرییان لە (ڕاستی) کردووە چونکە باوەڕیان وا بووە کە:

**ڕاستی دناڤ ئاگریدا نا سوژیت**

هەر ئەم (ڕاستی)یە هێزی وا دەداتە خاوەنەکەی، کە ئازاو دلێرانە ڕێی شێر بگرێتو لێی نەترسێت.

**ڕاست بەو ڕێی شێر بگرە**

ئیتر بە سەدان پەندی زیندیو کاریگەرمان بۆ ماوەتەوە، کە وەک مۆمی گەشی شەوەزەنگ تاریکی دەرەوێنێتەوەو ڕێگەکانی ژیانمان بۆ ڕوناکدەکەنەوە، بەڕاستی هانماندات بۆ یەککگرتن و تەبایی و برایەتی:

**برا لە پشت برا بێت مەگەر قەزا لە لای خودا بێت**

# لێکۆڵینەوەی تازەی ئەدەبی کوردی

ئەدەبی کوردی، وەک ئەدەبی گەلانی تر بە فۆلکلۆر دەست پێدەکات. واتە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی لە ئەدەبی نووسراو کۆنترەو سەرچاوەی ئەوە، بەلام دەتوانین بپرسین ئەدەبی نووسراوی کوردی لە کەیەوە دەستی پێکردووە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەتوانین پشت بە بیروڕای چەندین کەس لە شارەزایانی ئەدەبیاتی کوردیو زانایان ببەستین. ڕەنگە جاروبار ڕای ئەو شارەزاو زانایانە هەندێک جیاواز بێتو هەر یەکە شاعیرێک بە یەکەم شاعیری کورد دابنێت. هەندێکیان سەرەتای ئەدەبی کوردی دەبەنەوە بۆ پێش ئیسلامو نکۆڵی لەوە ناکەن، کە کورد پێش ئیسلام هۆنراوەی هەبوو بێت، بەلام بەڵگەو نمونەی ئاشکرا بۆ ئەو هۆنراوانە نابینن.

لەبەر ئەوە سەردەمی (سەلجوقی) بە سەرەتایەکی ڕوونو بێگومانی هۆنراوەی کوردی دادەنێن، واتە هەر لەو سەردەمەوە کە ولاتی ئیسلامیی بچوک پەیدا بوو، نەتەوە موسڵمانە نا عەرەبەکان چوونەوە سەر زمانی زگماکی خۆیان و زمانی کوردیش ئەو ڕێگەیەی گرتو لەناو کوردیشدا ئەدەبی نووسراو بە ئاشکرا پەیدا بوو.

لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین، کە شارەزایانی ئەدەبی کوردی هەر لە سەرەتاوە قۆناغەکانی ئەدەبی کوردی بە چەند جۆرێک دابەشدەکەن:

١. بە پێی شێوەزار:

هەندێکیان تەماشای ئەو شێوەیەی زمان دەکەن، کە بەرهەمەکەی پێ نووسراوە، کە ئەمیش چەند هۆیەکی مێژوویی هەیەو بەستراوە بە مێژووی کوردو میرنشینەکانیو مێژووی لەمەو دوایەوە.

ئەمانە چوار شێوە زار بۆ ئەدەبیاتی کوردی دادەنێن کە ئەمانەن:

**ئ- ئەدەبیاتی شێوەزاری لوڕی**

**ب- ئەدەبیاتی شێوەزاری گۆران**

**پ- ئەدەبیاتی شێوەزاری کرمانجیی سەروو**

**ت- ئەدەبیاتی شێوەزاری کرمانجیی خواروو**

٢. بەپێی ساڵی لەدایکبوون:

هەندێک مێژوونووسی ئەدەبیشمان هەن، کە بەپێی ساڵی لەدایکبوونو مردن باسی شاعیرانو نووسەرانو بەرهەمەکانیان دەکەن.

٣. بەپێی ڕێبازە ئەدەبییەکان:

هەندێک لە مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی، بەپێی ڕێباز و پەیڕەوی ئەدەبی، سنورێک بۆ چەشنەکانی ئەدەبی کوردی دادەنێن.

**ڕێبازی ئەدەبی**

ئەوەیە کە کۆمەڵە هۆنەرو نووسەرێک یەک ڕێبازیان هەبێتو لە ڕووی شێوە ئەو بیرو باسانەی، کە دەریان دەبڕن، نزیکی یەک بنو گەلێک دیمەنی ئەدەبی بە یەکتریانەوە ببەستێت، با هەریەکە چێژێکی تایبەتیش لە بەرهەمەکەیدا ببینرێت.

بەشـێوەیەکی گشـتی لـە ئەدەبیاتـی کوردیـدا سـێ ڕێبـازی ئەدەبـی دەبینرێـت کـە ئەمانـەن:

## یەکەم:- ڕێبازی کلاسیکی:

ئەوەیـە کـە کۆمەڵـە هۆنـەرو نووسـەرێک لەسـەر ڕێچکەیـەک دەڕۆن، کـە گەلێـک کـەس لـە پێش ئەوانـەوە لەسـەر ئـەم ڕێچکەیـە ڕۆیشـتووە، هەتـا وای لێدێـت ناتوانـن بەهیـچ شـێوەیەک لـەم ڕێگەیـە لابـدەن، بەڵکـو هـەر لاسـاییو پەیـڕەوی ئـەوان دەکەنـەوە، وشـەو دەربڕینەکانـی ئـەوان دووبـارە دەکەنـەوە، زیاتـر گرنگـی بـە ڕوخسـارو وشـەکاری دەدەن، کێشـی عـەروزو سـەروای یەکگرتـوو بەکاردەهێنـن. وەک ئەم نمونەی نالی:

**هەر چەندە کە عومری خدرو جامی جەمت بوو**
**چـــونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو**
**ئەی جامیعی دونیاو قیامەت بە خەیاڵات**
**ئەو ڕۆژە کە مردی نە ئەوت بوو نە ئەمت بوو**
**بێزارە لە تۆ ئێستە هەم ئاغوشی عەدوتە**
**دونیا کە لە کن خۆت حەرەمی موحتەرەمت بوو**
**دوێنێ چ بوو دەتدا بەزمانی لافی کەرامەت**
**ئەمڕۆ نە دەمت بوو نە دەمت بوو نە دەمت بوو**
**عومرت نەفەسێکە لە هەموو عالەمی باڵا**
**بمرە لە غەمی دا کە هەموو سەرفی غەمت بوو**
**وەک شەلتە پەیین گەهـ پڕو گەهـ خاڵییە بەتنت**
**سەوم ئەمەلت باعیسی نەفسو شکەمت بوو**

**نالی چییە وا میسلی جوعەل غەرقی شیاکەی**

**خۆ تۆ بە حیسابێ وەکو پەروانە شەمت بوو**

(( دوو دێری بۆ لەبەرکردنە))

## دووەم:- ڕێبازی ڕۆمانتیکی:

بریتییە لە هیواو ئاواتو نا ئومێدیو فرمێسک ڕشتن. لە ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکیدا خەیاڵێکی فراوان دەبینرێت، زیاتر گرنگی بە ناوەرۆک دەدرێت، لێرەدا ئەوەی پێویستە بوترێت ئەمەیە، کە ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکی کوردی لە هیواو ئاوات دەربڕینو نا ئومێدیو گەڕانەوە بەرەو دواوە جیاواز بووە لەگەڵ ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکیی ئەوروپا، چونکە هی ئەوان بەسترابووەوە بە چینێکی دیارکراوی کۆمەڵ، کە چینی بورژوازی بوو، ئەم چینە لەدوای شۆڕشی پیشەسازی، وەک چینێکی تازە سەری هەڵدابوو، بەڵام ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکیی کوردی بەستراوە بە هەموو گەلی کوردەوە، هیواو ئاواتی شاعیرانی کورد سەرکەوتنی گەل بووەو لە کاتی نسکۆو چەوساندنەوەدا بێ ئومێدیو ڕەشبینیو فرمێسک ڕشتن لە بەرهەمەکانیاندا دەرکەتووە.

ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکیی کوردی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە وەک ڕێبازێکی ئەدەبی سەریهەڵداوە، تا دوای جەنگی دووەمی جیهانو دواتر بەردەوامبووە. ئەمەش نمونەیەکە لە هۆنراوەی ڕۆمانتیکی کوردی کە دڵداری شاعیر داینـاوە:

## خەندەکەی بایی

لە ئافاقی ژیانی نا ئومێدیم خەندەکەی بایی
فریشتەی پاکی هیوامی نیشاندام وا کە بیدوێنم
پڕیشکی تیشکی ئەستێرەی جوان ئیمشەو بە ئەسپایی
بە سۆزی هاتە نێو کونجی دڵی تاریکی پڕ خوێنم
دەسا ئەی مەسدەری هەستی
دەخێرا لادەری پەستـــــــــی
وەرە تا من بە ڕازی تۆ نەمامی شادی بڕوێنم
** **

جوانی غونچەیێ بوو وا کە پەنجەی ڕازی ڕاکێشای
دە سەیری چەند بە وەسلی زولفی خاوت شادو مەسروورە
لەڕووی ڕاستی ئەتۆش وەک ئەو گولێکی چیمەنی دونیای
کەچی تاجی دڵی هێشتا دڵت لەم حالە ڕەنجوورە
بەخەندەی نەرمی دڵ پاکیت
ئەخۆم سوێندێ بە ڕووناکیت
ئەگەر هەستێ بە ژین وابێ لە جەرگی ڕاستیا دوورە
** **

کۆپلەی یەکەمی بۆ لەبەرکردنە

## سێیەم :- ڕێبازی ڕیالیزم :

ئەگەر پێناسەیەکی کورتی ڕیالیزم بکەین، دەتوانین بەو هونەرو ئەدەبەی دابنێین، کە ژیان بە هەموو دیمەنو واتای قوڵو بەرینییەوە، بە چاوی ئەم هونەرمەندە یان ئەو نووسەرو شاعیرە پیشاندەدات.

ڕیالیزم ئاوێنەی ژیانە، هەر هونەرمەندێک بە چەشنێک ئەو ژیانە پیشاندەدات، بەڵام هونەرمەندی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە هونەرو بەرهەمەکەی دەبەستێت بە خەڵکەوە، ئاوێنەی خەباتی درێژی خەڵکە لە پێناوی ئازادیو بە خۆشی ژیاندا، دژی چەوساندنەوە بە هەر چەشنێک بێت، لە ئەدەبیاتی ڕیالیزمیدا گرنگی بەڕوخسار و ناوەڕۆک دەدرێت.

ئەگەر بەم چاوە تەماشای ڕیالیزم بکەین لە ئەدەبی کوردیدا، ئەوا بە ئاشکرا ڕاستی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئەدەبی کوردی لەبەر ئەوەی، هەر لە سەرەتاوە پێویستی ژیان هێناویەتە کایەوە، کە پێویست بە گەڕانەوەیە بۆ زمانی زگماکی کوردی، چونکە هەر لەو سەرەتایەوە هەندێک ڕەگەزی دەربڕینی ژیانی خەڵکی تێدا بووەو ڕیالیزم لە زەوی ئەو ئەدەبە ڕەگی داکوتاوە، ئەمەش بە تەواوی لە هۆنراوەکانی (بابا تاهیری هەمەدانیو فەقێی تەیرانو ئەحمەدی خانیو حاجی قادری کۆییو نالیو سالمدا ) دەبینین، بەڵام ڕیالیزم زۆری ویستووە تا بووە بە ڕێبازێکی ئەدەبی دیارو سەربەخۆ.

## سەرهەڵدانی ڕێبازی ڕیالیزمی کوردی

دەتوانین بڵێین سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان، سەردەمی کۆتایی هاتنی قۆناغی ئەدەبیاتی کلاسیکیی کوردییەو دەستپێکردنی ڕێبازێکی تازەی ئەم ئەدەبیاتەیە، کە ئەویش ڕیالیزمە وەک سەرەتایەک، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە ژیانی گەلی کورد پێویستیی بە بەرهەمێکی ئەدەبی هەبوو، کە هیواو ئاواتو داخوازییەکانی گەلی کوردی تێدا ڕەنگبداتەوە، بەم جۆرە دەتواندرێت بوترێت، ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردی لە نێوان جەنگی یەکەمو دووەمی جیهان سەریهەڵداوەو لە پاش جەنگی دووەمی جیهان بە تەواوی چەسپاوەو جێگیربووەو دەستی بەسەر ئەدەبیاتی کوردیدا کێشاوە، واتە لەو ململانەی نێوان ڕێبازە ئەدەبییەکاندا ڕیالیزم سەرکەوت.

## هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەدەبی ڕیالیزمی کوردی:

بێگومان سەرکەوتنی ڕیالیزم شتێک نییە، لە خۆیەوە هاتبێتو نەبەسترابێت بە باری کۆمەڵایەتیو ئابوریو ڕامیاریی کوردستانو ناوچەکەوە، بەڵکو باری ئەو سەردەمەی جیهانیش کاریگەری تەواوی کردە سەر ئەم کێشەیەو ئەنجامەکەی، بەتایبەتی ئەو گۆڕینەی، کە بەسەر گەلێک لایەنی ژیانی مرۆڤایەتیدا هات لە ئەنجامی جەنگی دووەمی جیهانەوە، واتە هۆکارە دەرەکییەکان، وەک:

١. ژێرکەوتنی بەرەی فاشیزم.

٢. سەرکەوتنی بەرەی دیموکراسی.

٣. سەربەخۆیی گەلێک لە وڵاتان وەک هیندستانو ئەندەنوسیا.

٤. کشانەوەی سوپای بێگانە لە سوریاو لوبناندا.
٥. سەرکەوتنی چینی کرێکار لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاو چیندا.
٦. پێکهاتنی بەرەیەکی مەزنی سوشیالیستی.

لە کوردستانیشدا هۆکاری ناوەکی ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە بۆ نمونە ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد و لەناوچوونی ئەو کۆمارە بە دەستی ئیمپریالیزمی جیهانو کۆنەپەرستانی ئێران، ئەم هۆکارانە کاریگەریەکی زۆر گرنگیان کردە سەر ئەدەبی کوردیو وایلێهات، کە بتوانین ماوەی دوای جەنگی دووەمی جیهان بە سەردەمی بەرزبوونەوەو بەرەو پێشچوونی ئەدەبی کوردی دابنێین، بەتایبەتی ڕێبازی ڕیالیزمی کوردی.

## باسەکانی ئەدەبی ڕیالیزمی کوردی:

ئەگەر بچینە ناو ئەدەبی ڕیالیزمی کوردی و چاوێک بەو باسانەدا بخشێنین، کە شاعیران و نووسەران لێیاندوواون و کردوویانن بە کەرەستەی ڕازاندنەوەی بەرهەمی خۆیان. ئەوانەی کە بەرهەمی ئەدەبی ڕیالیزمیان نووسیووە، هەر لە ساڵانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا ساڵی (١٩٦١)ز ئەم چەند باسەی خوارەوە دەگرێتەوە.
١. باسی گیروگرفتی کۆمەڵایەتیو هۆی دواکەوتنی کوردەواری واتە لە بارەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو هەندێک دیمەنی شارستانی تازەوە.
٢. ژیانی جوتیاری کوردو دیمەنی ڕەنجکێشانی و هەروەها کێشەی نێوان جوتیارو دەرەبەگو دیمەنی خەباتی جوتیاری کورد.

٣. ژیانی کرێکاران‌و ڕەنگدانەوەی پەیدابوون‌و گەشەسەندنی چینی کرێکار بەتایبەتی لەناو کورداو بەگشتی لە عیراقدا، هەروەها بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی چینی کرێکار و باڵادەستی ئەو بیروباوەڕە، کە دەبێتە هۆی پتەوبوونی ڕۆڵی ڕابەرانەی کرێکار لە کۆمەڵدا.

٤. خەباتی ئازادیخوازانەی نەتەوەی کورد لە پێناوی مافی نەتەوایەتی و ڕەوای خۆیدا، کە ئەمە بەشێکی گەورەیە لەبەرهەمی ئەدەبی ئەم سەردەمەمان‌و هەندێک لە شارەزایان بە هۆنراوەی سیاسی لە ئەدەبیاتی کوردیدا ناوی دەبەن، دیارە هەر وەک خەباتی نەتەوەی کورد خۆی لە خەباتی ئازادیخوازانەی گەلانی ئەم ناوچەیەو هەموو جیهان نابێتەوەو بەشێکە لە خەباتی ڕەوای ئادەمیزادی ئەم سەردەمە بەرامبەر بە کۆنەپەرستی‌و سەرمایەداری‌و چەوساندنەوەو ئیمپریالیزم، هەروەها ئەم چەشنە بەرهەمەش لە ئەدەبی کوردیدا باسی خەباتی نەتەوەی کورد لەو خەباتە قوڵو فراوانە جیاناکاتەوە.

هەر ئەم گیانە بەرزو بەنرخەی مرۆڤ وایکردووە، کە نرخدان بە مرۆڤ لە ئەدەبی ئەم سەردەمەماندا ڕەنگبداتەوەو مرۆڤ بە بەرزترین‌و بەنرخترین سامان‌و سەرمایەی جیهان بزانرێت، هەر لەبەر ئەمەشە دیمەنی ئافرەت‌و سروشت لە ئەدەبی ئەم سەردەمەماندا وێنەیەکی تازەی هەیە، کە بەڕاستی بەرەو ئەوە دەڕوات، کە لەگەڵ ڕێبازی ڕیالیزمی ئەدەبیاتی جیهاندا یەکبگرێت.

ئەم ڕێبازە تازەیەی ئەدەبیاتمان‌و ئەم باسانە تەنیا لە هۆنراوەی کوردیدا بەدی ناکرێت، بەڵکو لە پەخشانیشدا تەواو دیارن، لە پەخشانی کوردیدا دیمەنی ڕیالیزم‌و بەستانەوەی بە ژیانەوە لە دیمەنی هەموو ڕێبازەکانی تر ئاشکرا ترە. ئەمەش بەستراوە بە

سـەردەمی پەیدابـوونو گەشەسـەندنی هەمـوو جۆرەکانـی نووسـینی پەخشـان لـە ئەدەبیاتـی کوردیـدا، کـە زۆرتـری لـە سـەدەی بیسـتەمدایە، یـا پاش جەنگـی یەکەمـی جیهانـە، کـە ئەمـەش سـەردەمی گەشەسـەندنی ڕیالیـزم خۆیەتـی لـە کاتێکدا، کـە نـاوەڕۆکو باسـی ئەدەبیاتـی کـوردی تـازە بـووەوە، بێگومـان ڕوخسـاری ئەدەبەکـەش بـەرەو نوێبوونـەوە چـوو.

ئەمـەش نمونەیەکـە لـە هۆنـراوەی ڕیالـزم لـە ئەدەبـی کوردیـدا کـە لەلایـەن محەمـەد شـێخ حوسـێن بەرزنجـی نوسـراوە:

## پەندی برسی

**شەوو ڕۆژ من عەرد ئەکێڵم**
**بە دوای ئیش کردنا وێڵم**
**لە دەست برسێتی ڕائەکەم**
**ئەم لا ئەکەم، ئەولا ئەکەم**
**نەنان، نە ئیش هیچیان نییە**
**نازانم هۆی ئەمە چییە**
**هێزو تواناو تینی گەنجم**
**هەوڵو ئیش کردنو ڕەنجم**
**بیرو لێکدانەوەو هۆشم**
**بە نانە سکێ ئەفرۆشم**
**کەچی هێشتا لێم ناکڕن**
**دوای سووڕانەوەم نابڕن**
**ئەم خاوەن پارە زۆرانە**
**ئەم سەرداره خوێن خۆرانە**

**واتی ماوم نازانم چۆن**
**پارووپەک نان، بەرگێکی کۆن**
**پەیدا کەم، ئەم ژەهری مار کەم**
**بەویش ئەم ڕووتی یەم چار کەم**
**کاکە تۆ نازانی چیمە**
**هەرچی پارەو پوول بێ نیمە**
**ڕووتم عوریانم برسیمە**

(سێ دێر بۆلەبەرکردن)

لەم هۆنراوەیەدا شاعیر ژیانی هەژارانو زەحمەتکێشانی خستۆتە ڕوو، دیمەنی چەوساندنەوەو ئێشو ئازاری ئەوانەی بێ ئێشو کارن پیشانداوە، بۆ مەبەستی چارەکردنی دەردی نەبوونیو برسێتی.

## وەرزی یەکەم

# حاجی قادری کۆیی
## (١٨١٧ - ١٨٩٧) ز



حاجی قادر کوڕی مەلا ئەحمەدە، لە گوندی (گۆڕ قەرەج)ی شاری کۆیە لە ساڵی (١٨١٧)ز لەدایکبووە، لە ئەستەنبۆل، لە ساڵی ١٨٩٧ز کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ هاتییە ڤەشارتن.

حاجی، یەکێکە لە شاعیرە نەتەوە پەروەرو نیشتمانپەروەرەکانمان، سەرەتای ژیانی شاعیرییەتی لە کوردستان عیراق‌و ئێران دەست پێکردووە، چونکە پاش گەشتەکەی ناوچەی باڵەکایەتی کە لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە ، ڕوودەکاتە کوردستانی ئێران‌و ماوەیەکی زۆر لەوێدا دەمێنێتەوە.

شیعرەکانی ئەو سەردەمەی حاجی لە تەوەری دلداری‌و ئەڤینییەوە دەسوڕانەوە، ماوەیەکی زۆر پاش گەڕانەوەی لە گەشتی خوێندنەکەی، لە کۆیە دەمێنێتەوە، بەڵام وا دیارە مەلایەکی ڕوناکبیری وەک حاجی نەشیایە لەناو کۆمەڵی ئەو کاتەی کۆیە ژیانەکا ئاسودە بەسەر ببات، هەر ژ بەر هندێ ناچار بویە، کو ڕووبکەتە ئەستەنبۆلی پایتەختا دەوڵەتا عوسمانلی‌و هەمی ژیانا خۆ ل وێرێ بسەر ببەت.

هەژی گۆتنێیە، کو حاجی تا نەچووەتە ئەستەنبۆل زۆر بەلای شیعری نەتەوەیی‌و کۆمەلایەتیدا نەچووە، دیارە وەچەرخانی حاجی بەلای ئەو جۆرە شیعرانەدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی وەک:

١. حاجی لە ئەستەنبۆلێ کەوتە ناو ژیانێکی نوێ‌و تازەوە، ئەو ژیانە نوێیە گۆڕانێکی سەرەکی بەسەر بیروباوەڕی حاجی داهێنا، چونکە

شاری ئەستەنبۆلی ئەو کاتە جێی کۆبوونەوەی هەموو ئازادیخوازانی ژێر دەستەی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بوو، بۆیە حاجی ئاگاداری تێکۆشانی ئەو نەتەوە ژێر دەستانەی عوسمانی بوو، ئاوڕێکی لە میللەتەکەی خۆی دایەوەو کانیاوی شیعری نەتەوەیی لای ئەو تەقییوەتەوە.

٢. لە شاری ئەستەنبۆڵدا، حاجی بە بنەماڵەی کورد پەروەری بەدرخانییان گەیشتو بوو بە مامۆستای کوڕەکانییان، دیارە ئەو بنەماڵەیە کورد پەروەر بوونو دەمێک بوو لە پێناو ئامانجە ڕەواکانی کورد درێژەیان بە خەباتو تێکۆشانو بەرخۆدان دەداو کارێکی گەورەیان کردە سەر بیروباوەڕی حاجی قادر.

٣. حاجی قادر، هەر لە ئەستەنبۆڵدا، مەمو زینی ئەحمەدی خانی کەوتە دەستو پێشەکییەکەی خوێندەوە، ئەو پێشەکییەو دەیان کتێبی ڕەوشنبیری تازە بابەت، کە لە ئەوروپاوە دەهاتنو دەکران بە تورکیو دەهاتنە بڵاوکردنەوە، وایانکرد، کە بیرو هەستی نەتەوایەتی لای حاجی سەر هەڵبدا.

٤. دیارە ئاوارە بوونو دوورکەوتنەوە لە زێدی باوو باپیرانمان کارێکی گەورە دەکاتە سەر مرۆڤ و وای لێدەکات، کە هەمیشە بیرو باوەڕو هەستو هۆشی لای وڵاتو شارەکەی بێت، لەبەر ئەوە مرۆڤی ئاوارەو دوورە وڵات، بەتایبەتی ئەگەر وەک حاجی ڕووناکبیریش بێت، هەمیشە سۆزو هەستی لای نیشتمانەکەی دەبێت.

هەر چەندە حاجی قادری کۆیی بە یەکەم شاعیری نەتەوەیی دانانرێ چونکە بەر لە ئەو ئەحمەدی خانی (١٦٥٠-١٧٠٦)ز وەک ڕابەری شیعری نەتەوەیی لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەردو ئازاری کوردی

دەست نیشانکردووە، بەڵام حاجی سەرەڕای دەست نیشانکردنی ئەو دەردانە، زۆر جاریش هەوڵیداوە چارەیان بۆ بدۆزێتەوە، بۆ نمونە:

١. حاجی دەردێکی کوشندەی لای کورد دەست نیشانکردووە، کە دووبەرەکیو نا تەباییو دوژمنایەتی کردنی یەکترییە، دەرمانی ئەم دەردەش لای ئەو تەنیا هەر ڕێککەوتنو یەکڕیزییە.

**تا ڕێک نەکەون قەبیلی ئەکراد**

**هەروا دەبنە خەرابە ئاباد** (بۆ لەبەرکردن)

٢. حاجی، دوژمنی سەرەکی دەست نیشانکردووە کە تەماحکارو داگیرکارانی کوردستانن، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دوژمنەش (چەک)ی بە چارەسەر داناوە، چونکە وا دیارە ئەو کاتەش زمانی سەردەم چەک بووە، بۆیە دەڵێت:

**صەلاحی ئێوە ئیستێکە سیلاحە**

**تەماعی گەورەیی بێ چەک نەکەن نەک** (بۆ لەبەرکردن)

٣. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، حاجی وەک هەر ڕووناکبیرێکی تازە، زانستو چەکی، پێکەوە کردوون بە دوو مەرجی سەرەکیو بنەڕەت بۆ خەباتو بەگژداچوونەوەی دوژمن، بۆیە دەڵێن:

**بەشیرو خامە دەوڵەت پایەدارە**

**ئەمن خامەم هەیە، شیر نادیارە** (بۆ لەبەرکردن)

٤. دیسان ڕووناکبیریو تێگەیشتوویيو هوشیاری حاجی لەوەدا بووە، کە ڕێکخستنی یا بەزمانی ئەمڕۆ، پێکهێنانی حزبو ژیانی پارتایەتیو کاری نهێنیو تەگبیرکردنو پەیداکردنی چەکو تفاق شەڕ بە مەرجی سەرکەوتن دادەنێت.

٥. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە، کە حاجی پێی وابووە، کە پێویستە

گەل بەدەوری سەرکردەییک کۆبێتەوەو ئەو سەرکردەیە وەک ڕابەرو پێشڕەوی خەباتی نەتەوەیی میللەت لە دەوری خۆیدا گردکاتەوەو بەرەو ئامانج بیان بات. ئەمەش لەم هۆنراوەیەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت:

**لە ڕۆما کەوتە بەر چاوم کەسێکی هائیمو حەیران**
**بە هەیئەت تێی گەییم کوردە بە شێوەی ئەهلی کوردستان**
**کە چوومە خزمەتی پرسیم: برادەر خەڵکی کام جێگای؟**
**لە کام لا هاتووی؟ گریا، گوتی: بابان! گوتم: بابان؟**
**دڵم داوە گوتم: باوکە هەمووومان بێ کەسین لێرە**
**چ قەوماوە، گەلێ حەیفە، مەگریێ هەر وەکوو باران**
**گوتی بۆ غوربەتو ڕووتی نییە ئەفغانو هاوارم**
**لە داخی حاکمی خۆمە، لە شانو شەوکەتی تورکان**
**گەلێکم بیستووە پەستیو بڵندیی دەوڵەتان، ئەمما**
**جیهان نەیدیوە پەستی وا میسالی حاڵی کوردستان**

## واتای پەیڤەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| نەشیایە | نەیتوانیوە |
| هەژی گۆتنێیە | ئەوەی شایانی گوتنە |
| ئاوارە بوون | مشەخت بوون، دەربەدەر بوون |
| بابان | مەبەستی ناوچەی میرنشینی بابانە |
| ئەفغان | فوغانو گریان |
| هەموو شابوون | هەمی شاە بوون (پادشاە بوون) |
| بێ غەمو شابوون | بێ غەمو شادبوون |
| جلیتوڕمبوڕمبازی | جلیدانو ڕمبازی |
| شەش پەڕ | جۆرە تفەنگێکە |
| شەش پەڕوشەشخانە | ناوی تفەنگن |
| جونبوش | لەرزین |
| قەلغان | مەتاڵ |
| لەماهی بگرە تا ماهی | لە ماسی تا مانگ (هەیڤ) |
| جوغد | جۆرێکە لە کوندەبوو. |
| سەراپا | سەر تاپا، هەمووی ژ سەری تا پێیا |
| دوژمن ئەندازە | دوژمن بە زێنە |




## وەلی دێوانە
## (١٨٢٦- ١٨٨١)ز

ناوی (وەلید)ەو لە دەوروبەری ساڵی (١٨٢٦)زاینیدا لە ناوچەی (بەکراوا) لە هەڵەبجە لەدایکبووە. لە تیرەی میکاییلیو لە خێڵی جافە، ئەو خێڵەی گەرمیانو کوێستانیان دەکرد، هەر لە منداڵییەوە شوان بووە، کە مەزنیش بوو، خۆشەویستیو ئەڤینی (شەمسە) یا (شەم)ی کەوتووەتە دڵەوە، ئەم خۆشەویستییە سەرچاوەو ئیلهامبەخشی شیعری وەلی بووە، زۆربەی شارەزایانی ئەدەب لەو باوەڕەدان، کە نەخوێندەوار بوو بێت، بەڵام چەند نیشانەیەک بە لای ئەوەدا دەچن، کە دەبێت خوێندەواری هەبووبێتو شارەزاو ئاگاداری شیعرەکانی حافزی شیرازیو فیردەوسیو سەعدی بوو بێتو ئەمانە یەکێک بووبن لە سەرچاوە زۆرەکانی ئیلهامی شیعری وەلی، بەشێوەزاری گۆران شیعری نووسیوە.

لە هۆنراوەدا زیاتر بە لای مەبەستی دڵداریو ئەڤینیدا چووە. زمانی شیعریی ڕەوانو سادەو ئاسانبووە، هەموو کەس تێیگەیشتووەو ئەم ئاسانییە تامو چێژێکی مىللییان بە شیعرەکانی داوە،
ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هۆنراوەکانی بە کێشی برگەیی خۆماڵی داناوەو بەشی زۆریشیان هۆنراوەی (دە) برگەیین، لە ساڵی ١٨٨١ز کۆچی دواییکردووە.

نمونەیەک لە هۆنراوەی وەلی دێوانە

## یـاران نـەجـەرگم

**یاران نە جەرگم، یاران نە جەرگـــــــم**
**من شەم شێوەیێ تیردان نە جەرگـــــم**
**هەر وەخت کە مەیۆ ئاکامی مەرگـــــم**
**ئەمانەت کەفەن نەکەن وە بەرگـــــــم**
**بەو شەرت نەشۆران حاشیەی ئەندامم**
**نە واکم پێش بۆ زوخاو نەزامـــــــــم**
**شەهید وەبێ غەسل بێ کفن خاســـەن**
**هەرکەس شەهیدەن هوون بێ قەساسەن**
**بەڵام وەسیەتم جەلاتان ئیـــــــــــدەن**
**ئەر سەد دوور نە خاک گۆرخانەو زێدەن**
**با هەر مەزارم نە ڕای خێڵان بـــــــۆ**
**نە گوزەرگای شەم جەبەل گێلان بـــۆ**
**میلێ وە ئەندام بە ژنو باڵای شـــــەم**
**بکەن بە فەرقم بەبێ زیادو کـــــــەم**
**تاقێ هەر نە تەرح تاقی ئەبرۆی ئـــەو**
**بسازان نە فەوق مەزارم جەنـــــــــەو**

سێ دێر بۆ لەبەرکردن

# واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| ١. نە جەرگم | : | لە جەرگم |
| نە | : | لە |
| تیردان | : | تیری داوە، تیری لێداوە |

(یاران‌و دۆستان، کەسێک، کە لەشێوەی (شەم)دایە، تیری لە جەرگی من داوە)

| | | |
|---|---|---|
| ٢. مەیۆ | : | دێ، دێتن، دهێت |
| ئاکامی مەرگم | : | وەختی مەرگو مردنم، وەختێ مرنا من |
| ئامانەت | : | دەخیل، تکا، ئامان |

(هەر کاتو گاڤەکی کە کاتو وادەی مردنم دێت، تکاتان لێدەکەم کفنم بۆ مەکەن بە بەرگ)

| | | |
|---|---|---|
| ٣. نەشۆران | : | نەشۆن |
| نەواکم | : | نەوەکو، نەبادا |
| پێش بۆ | : | پێوە بووبێ، پێڤە بیتن |
| زوخاو | : | خوێناو- خویناڤ |
| نەزاحم | : | لە برینم |
| زام | : | برین |

(بەو مەرجەی کە حاشیەی ئەندامەکانم نەشۆن، نە بادا زامو برینێن من خوین پێڤە بیتو ژ ئەگەرا شوشتنا وان ئەڤ خوینە پێڤە نەمینت)



# پیرەمێرد
## (١٨٦٧ - ١٩٥٠) ز

حاجی تۆفیقی کوڕی مەحمود ئاغای مەسرەفە، لە ساڵی ١٨٦٧ز لە شاری سولەیمانی لەدایکبووەو لە زۆربەی مزگەوتەکانی سولەیمانی خوێندوویەتی، لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید (کە دەکاتە باوکی شێخ مەحمودی نەمر) چووە بۆ تورکیاو لەوێوە دوایی چوونەتە حەج. لە نووسینی فارسیدا دەستێکی باڵای هەبووە، دەکرێتە ئەندامی مەجلیسی عالی لە ئەستەنبوڵ، هەر لەو کاتەدا دەچێتە (مەکتەبی حقوق) و بڕوانامەی حقوق وەردەگرێت، هەر زوو دەستی بە ڕۆژنامەنووسی کردووەو ڕۆژنامەی (کورد)ی لە ئەستەنبوڵ بەڕێوەبردووە، ئینجا بووە بە قایمقامی (جۆلە مێرگ) و دەبێتە پارێزگاری (ئەماسیە) لە تورکیا، لەدوایدا دەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی، لە ساڵی ١٩٢٦ز دەبێتە سەر پەرشتکاری ڕۆژنامەی (ژیان)، کە لەلایەن شارەوانی سولەیمانی دەردەچوو، لە ساڵی ١٩٣٧ز چاپخانەیەکو ڕۆژنامەیەکی دامەزراند بەناوی (ژین)ەوە، لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٠ز کۆچی دواییکرد، لە گردی مامەیارە نێژراوە.

پیرەمێردی شاعیر، خاوەنی بیرو باوەڕێکی پێشکەوتووی ڕوناک بوو، باوەڕی تەواوی بە زانستو خوێندەواری هەبووە، زۆریش لای گرنگ بووە، کە کچانی کورد بچنە قوتابخانەو بخوێنن، بە تێکڕایی پشتگیری لە مافی ژنان دەکردو ئەوانی بە نیوەی کۆمەڵ دادەنا، سەرەڕای ئەمەش بیرو باوەڕێکی نەتەوەیی بەهێزی هەبووە، هەر ئەوەندەش بەسە بۆی، کە جەژنی نەورۆزی زیندوو

کردەوەو بەرگێکی نوێی کردە بەر، هەر لەم ڕوانگەیەوە هەوڵی دا نووسینی کوردی بکات بە لاتینی، بەڵام سەرنەکەوت. پیرەمێرد هەر وەک چۆن لە شیعردا دەستێکی باڵای هەبوو، هەروا لە (پەخشان) یشدا دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، پەخشانەکانی سادەو بێگرێ بوون، لە سەرەتادا هەموو ڕەگەزەکانی ڕەوانبێژی لە نووسینەکانیدا بەکارهێناوە، وەک (درکەو ڕەگەز دۆزیو خوازەو خواستن)، پەیڤو وشەکانی خۆماڵیو سادە بوون، بابەتەکانی نووسینی لە پەخشانیشدا مۆرکی ڕۆمانتیکیان پێوە بوو، لە نووسینەکانیدا کوردییەکی پەتی و ڕەوانی بەکارهێناوە. ژمارەیەکی زۆری چیرۆکی دانراوو وەرگێڕاوی لە تورکییەوە بڵاوکردۆتەوە وەک (دوانزە سوارەی مەریوان، مەمو زین، کەمانچە ژەن).

## شیعرەکانی پیرەمێرد دوو جۆرن:

ئـ - ئەو کۆمەڵە شیعرەی کە دەکەونە بەر ڕێبازی کلاسیک، کە بریتین لەو شیعرانەی، کە بەزۆری لە سەرەتای ژیانی شاعیرییەتیدا لە ئەستەنبوڵو لە تورکیا دایناونو لە ژێر کاریگەرییەتی شاعیرانی وەک (حافزی شیرازی فارسو نالیو سالمو حاجیو مەولەوی کورد)دا هۆنیوەتەوە.

ب- ئەو کۆمەڵە شیعرەی، کە دەکەونە بەر ڕێبازی ڕۆمانتیک، ئەمەش هەنگاوێک بوو بۆبەرەو پێشچوونی هونەری ئەدەبی لای پیرەمێرد، دیارە ئەم ڕێبازەی لە ئەنجامی کارتێکردنی شیعرەکانی (عەبدولحەق حامیدو نامق کەمال)ی تورک گرتووەتە بەر.

پیرەمێرد شەیدای شیعرەکانی مەولەوی بوو، بۆیە هەموو دیوانەکەی مەولەوی خستووەتە سەر شێوەزاری کرمانجیی خواروو، هەر لەژێر کاریگەرییەتی شیعرەکانی مەولەویو بێسارانیو وەلی

دیوانـەدا، دەبینیـن زۆربـەی هۆنراوەکانـی پیرەمێـرد (١٠) بڕگەییـن کـە ئەمـە شـێوەی شـیعری (گۆرانی)یـە لەنـاو کوردەواریـدا، بـەم جـۆرە لـە شـیعری یـەک سـەروا دوور کەوتووەتـەوە.

هۆنراوەکانـی پیرەمێـرد بەتایبەتـیو نووسـینەکانی بـە گشـتی چەنـد سـیماو ئەدگارێکیـان پێـوە دیـارە کـە ئەمانـەن:

١. لـە هۆنـراوەو نووسـینەکانیدا، کوردییەکی پەتـیو ڕەوانی بەکارهێناوە، شـارەزایی لـە هەمـوو شـێوەکانی زمانـی کـوردی هەبـوو، لەبـەر ئـەوە دەبینیـن، ئـەو زمانـەی کـە بـەکاری هێنـاوە، ڕەوانو سـڤکو ئاسـانو سـادەبووە.

٢. لـە هۆنـراوەو پەخشـانەکانیدا، هەوڵیـداوە لـە کۆمەڵانـی خەڵـک نزیـک بێتـەوەو بەرهەمێن خۆ ب زمانێ وان بنڤیسیت، داکو هەمی لێ تێبگەنو چەشـەو خۆشـیێ ژ شـیعرو پەخشـانێ وی وەربگرن، هەر ژ بەرهندێ ژی پشکەکا زۆرا شـیعرێن وی هەمیشـە ل سـەر زارێن خوێندەڤانان بوویە.

٣. لـە هەمـوو مەبەسـتەکانی هۆنـراودا بەرهەمـی هەیە، وەکو کۆمەڵایەتی، ئەڤینـی، نیشـتمانیو... تـد، بێجگـە لـەوەش، بەشـێکی زۆری پەنـدی پێشـینانی کـوردی کـردووە بـە هۆنـراوەو بڵاویکردووەتـەوە.

٤. زۆربـەی شـیعرەکانی مۆرکـی خۆماڵییـان پێوەیـە، چونکـە لـەم لایەنەوە کەوتووەتـە بـەر کاریگـەری شـیعرەکانی (مەولـەوی، بێسـارانی، وەلـی دێوانـە) بۆیـە بەشـی زۆری هۆنراوەکانـی لەسـەر کێشـی (پەنجـە)و کێشـی (١٠) بڕگەییـن.

٥. بەشـی هـەرە زۆری هۆنراوەکانـی، دەکەونـە خانـەی ڕۆمانتیکییـەوە، ئەمـەش لەبـەر کاریگەربوون بـە ئەدەبیاتـی تورکـی بوو، چونکـە پیرەمێرد شـارەزاییەکی تـەواوی تیـادا هەبـووە.

نمونەیەک لە هۆنراوەکانی:

**(ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا )**

**ئەبی بەخشندە مل کەچ کا، لە ڕاستی مووچە خۆری خۆی**
**سوراحی سەرفرودێنێ لە بۆ پیاڵە کە تێکا بۆی**
**کە ئاو داری لەسەر سەرگرتووە، ئەیزانی چی تیایە**
**لە لای نەنگە کە پەروەردەی نقوم کا، گەورەیی وایە**
**لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەردوو دار**
**پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لە قەش بۆ سەرپەلی بەردار**
**لە دەوری دووریا پەستم دەروون پڕ دەردو زووخاوم**
**ئەجەل دێ بمکوژێ، نامناسێ چی بکەم نامرم ماوم!!**
**لەبەر ئاشووبی خێڵم، هیچ شەوێ خەو نایەتە چاوم**
**خەوی ناخۆش ئەبینم، بەم پەریشان خاوییە خاوم**
**ئومێدی سەر لەسەر دەرکەن ئەوانەی ڕاستو ڕووناکن**
**قەڵەم هەر سەرقەڵەم، مۆم بۆ مقسەت، هەر بۆ ئەویش چاکن**
**ئەڵێن مورغی سولەیمان ئاو لەژێر خاکا ئەبینێ ئەو**
**منیش حەوت ساڵە ڕێ دوور بێ، بە چاوی دڵ ئەبینم ئەو**
**چرا ڕوناکی بۆ ژێر خۆی نییە، ڕەحمەت لە با بیبا**
**ئەوی ڕوناکی کەچ بینانە گۆرە ڕەنجی با بیبا**
**بە جووت پەروانە و ماسی کە دڵدادەی چراو گۆلن**
**نزیکی ئەم ئەسووتێنێ، لەدووری ئاو ئەوان حۆلن.**

سێ دێر بۆ لەبەرکردن

# واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| بەخشندە | : | ئەو کەسەی کە شت دەبەخشێ |
| مل کەچ کا | : | سەر شۆرکا |
| لە ڕاستی | : | لەبەرامبەری، ل هەمبەرا وی |
| سەر فرودێنێ | : | سەری شۆڕکا، خۆ سەرەو ژێر دەکا |
| لەلای نەنگە | : | لەلای شورەییە، لەلای عەیبە، شەرمە ل نک وی |
| پەروەردەی | : | ئەوەی خۆی بە خێویکردووە، ئەوی ب خۆ بخودان کری |
| نقوم کا | : | بیخاتە ژێر ئاوەوە |
| پەلی بەرد | : | گاشە بەرد |
| پەلی بەرز | : | لق و پۆپی بلّندی درەخت. |
| لەقە | : | پێن، پێلاقە |
| زووخاو | : | خوێناو |
| ئاشووب | : | شەڕو فتنەو هەراو هۆریا |
| خێڵ | : | قەوم، عەشیرەت |
| ڕەحمەت لە با بیبا | : | ڕەحمەت لەو بایەی کە دەیکوژێنێتەوەو دەیبا |
| گۆڕە | : | حەق وایە |
| دلّدادە | : | عاشق |
| گۆل | : | گوماو |
| حۆلن | : | گێژن |
| نێژراوە | : | هاتیە ڤەشارتن: بن ئاخ کرن. |



## هەژار موکریانی
## (١٩٢٠- ١٩٩١)ز

لاپەڕەکانی ئەدەبی کوردیمان هەموو دەم پڕیان بووە لە ناوی درەوشاوەی هۆزانڤانو شاعیری وا، کە جێی شانازی پێوە کردنن، هەژاری موکریانیش یەکێکە لەو گەورە شاعیرانە، ناوی (عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلا محەمەد)ە.

لە ساڵی ١٩٢٠ز لە شاری مەهاباد لەدایکبووە، لەبەر ئەوەی باوکی مەلا بووە بۆیە هەر زوو خراوەتە بەر خوێندنو لە سوختە خانەو مزگەوتان خوێندنی تەواو کردووە، هەر چەندە بە هیوا بووە ببێتە مەلاو جێی باپیران بگرێتەوە، بەڵام کۆچی باوکی ئەم هیوایەی لە دەستداوە.

هەر زوو هەوای نیشتمان پەروەری دەکەوێتە سەرو لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان ڕۆڵی هەبووە، لە پێناوی نیشتماندا توشی دەربەدەریو ئەشکەنجەدانو ئازارێکی زۆر بووە، ناچارکراوە لەدوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لە ساڵی ١٩٤٧دا ڕوو بکاتە عیراقو ماوەیەکی زۆر لە بەغدا پەناهەندە بێتو بەینێکیش لەناو کوردەکانی سوریادا ئاوارە بێت، هەژار لە خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، ڕۆلێکی دیاری هەبووەو لە شۆڕشی مەزنی ئەیلولی (١٩٦١)دا بەشداریکردووە، ئەندامی کۆڕی زانیاری کورد بووە، هەژار شاعیری دلداری نەبوو، عاشقی کێوو دۆڵو چیای کوردستان بوو،

ئازادیخـواز و پێشـکەوتوخواز و ئاشـتیخوازبوو، بەرهەمێکـی زۆری وەرگێڕراوەتـە سـەر زمانـی ئـازەری و ڕوسـی و فارسـی، لـە مـاوەی ژیانیـدا مرۆڤێکـی بەرهەمـدار بـوو.

## مـنو بـولـبول*

بولبول ئەی یارەکە دێرین خونچیلانەی دندوک زێڕین
هاوفەردی زووم بۆ هەژاری هاوڕێی پێشووم لە دڵداری
وەبیرت دێ پاییزی پار؟ ڕەشپۆشیی دەشتو زەردیی دار؟
گژەو گڤەت لە بادیبوو؟ هەوای پێش تەرمی شادی بوو
دەیدا خشپەی گەڵا ڕێزان خەبەری مەرگی ئازیزان
بەژنو باڵای نێرگزی مەست لە گێرەی گزرەدا پێ بەست
سوێسنەو مێلاقەی زەردو سوور بوونە دەستە چیلەی تەندوور
کڵۆ بەفری درشتو ورد چۆن سەر زەوی کفن دەکرد؟
کوندە بوومەو قەلی ڕووڕەش کەلەپووریان دەکردن بەش
منو تۆی برسیو بێ پەسێو لە کونجێ خزیو بێ بژێو
دەگریای بە بانگو هاوار بۆ خونچە بۆ گوڵ بۆ بەهار!

سێ دێر بۆ لەبەرکردنە

*(تێبینی: ئەمە دەقە شیعریە دروستەکەیە)

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| دێرین | : | کۆن، کەون، کەڤن |
| دندوک | : | دەنووک |
| هاوفەرد | : | هاورێ، هەڤاڵ |
| سوێسنە | : | سووسن، جۆرە گوڵێکە |
| بێ پەسێو | : | بێ داڵدە، بێ پەناگە |
| بێ بژێو | : | بێ کەرەستەی ژیان کە خۆراکە |
| خشپە | : | دەنگی بەلکو گەڵای درەخت کە لەسەر زەوی با لێیدەدا |
| گەڵا رێزان | : | گەڵاو بەلک هەڵوەرین. |
| مێلاقە | : | جۆرە گوڵێکی بەهارییە. |
| کلۆی بەفر | : | دانەی بەفر لەکاتی باریندا. |
| کفن دەکرد | : | وەک رەنگی کفن سپی دەکرد. |
| کەلەپوور | : | پاشماوەو شتی کۆنینە |



# دیـلان
## ١٩٢٧- ١٩٩٠

دیـلان نـاوی (محەمـەد سـالح) کـوڕی مـەلا ئەحمـەدی دیـلان کـوڕی مـەلا سـالح کـوڕی (مـەلا قـادری شـەو خوێـن)ە، کـە لـە قەڵاچۆلانـەوە هاتۆتـە سـلێمانی.

دیـلان لـە سـاڵی (١٩٢٧)ز لـە سـلێمانی لـە گەڕەکی گوێژە لەدایکبـووە، سـەرەتای خوێندنی لـە مزگەوتی شێخ بابـە عەلیو قوتابخانەی خالیدییە دەسـت پێکردووە، تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندووەو بووە بە فەرمانبەر. لەبەر بیرو باوەڕی نیشتمانپەروەریو نەتەوایەتـی، زۆر جـار تووشـی گرتـنو دوور خسـتنەوەو دەسـت بەسـەری بـووە، لـە ١٩٩٠/١٠/٢٨ کۆچـی دواییکـردووە.

دیـلان یەکێک بـوو لـە شـاعیرە ناودارەکانـی سـەدەی بیسـتەمی کـورد، مـەلا ئەحمـەدی دیلانـی باوکـی کـە پیاوێکـی ئـەدەب دۆسـتو شـارەزابوو، ڕێگای بـۆ خۆشکرد کـە ببێتـە شـاعیر. هەروەهـا هۆنـراوەی شـاعیرانی کـوردی وەک (مەولـەوی، سـالم، پیرەمێرد، حەمدی، گـۆران، مەحـوی) کاریـان تێکردووە، لـە هەمـان کاتدا هۆنـراوەی فارسـی کاری کردۆتـە سـەر بەهـرەی شـیعری بـە تایبەتـی هۆنـراوەی (حافـز، نیزامـی، سـەعدی).

یەکـەم هۆنـراوەی لـە بەندیخانـەی کـوت نووسـیوە، هۆنراوەکانـی لایەنـی نیشـتمانپەروەریو جوانـی وڵاتو دیمەنەکانـی لەخـۆ دەگرێـت، دیـلان لـە هۆنراوەکانیـدا بایەخێکـی زۆری بـە نـاوەڕۆکو بـاری هـزری داوەو ئەم لایەنە بە خەستی لەبەرهەمەکانیدا دیارە، ئەوەش دەگەڕێتەوە

بۆ باری ڕۆشنبیری و پلەی هۆشیاری و ڕادەی بەشداربوونی لە بزوتنەوەی نیشتمانی و پێشکەوتنخوازی و نەتەوەییدا.

دیلان دەسەڵاتێکی باڵای هەبووە لە بەکارهێنانی هێما (ڕەمز) بۆ دەربڕینی مەبەستی تایبەتی، چونکە لەبەر ستەم و زۆرداری و هێزی تاریکی ئەو سەردەمە نەیویستووە مەبەستەکانی ئاشکراو دیار بکات، بەم هێما بەکارهێنانە چەشنە هونەرێکی ڕەنگینو ڕادەیەکی بەهرەدارانەی بە بەرهەمەکانی گەیاندووە، هۆنراوەکانی دیلان لە ڕووی ناوەرۆکو مەبەستەکانەوە ئەم بابەتانە دەگرێتەوە:

## ١. جوانی سروشت:

بابەتی جوانی سروشت پێشتر لە هۆنراوەی (مەولەوی‌و گۆرانو پیرەمێرد) ڕەنگیداوەتەوە، دیلانیش کە شێوەی هونەری شیعری ڕۆمانتیکی بوو، شەیدای جوانی سروشتی کوردستانو دڵدارێکی کەم وێنەی دیمەنە ڕەنگینەکانی گوڵو گوڵزاری بەهار بوو، نەخشەکێشانی تابلۆیەکی سروشت یا وەسفکردنی دیمەنێکی سروشت لای شاعیر دەبێتە داهێنانێکو لایەنێکی گرنگی قوتابخانەی ڕۆمانتیکی تەواو دەکات، ئەم پەیوەندییە گیانییەی نێوان شاعیرو سروشت دەگەڕێتەوە بۆ گیانی خۆشەویستی بۆ نیشتمانو نەتەوەکەی.

## ٢. دڵداری‌و جوانی ئافرەت:

بابەتی دڵداری‌و جوانی ئافرەت وەک بابەتێکی هۆنراوە دیاردەیەکی کۆنە، لە بەرهەمی شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد ڕەنگیداوەتەوە، دیلانیش لە بابەتی خۆشەویستی ئافرەتو جوانی ئافرەتدا هەستێکی قوڵو سۆزێکی بە تینو کاریگەر لە هۆنراوەکانیدا بەدیدەکرێت، تا گەیاندوویەتی بە ڕادەیەکی زۆر بەرز، کە هیچ

جوانییەکی تر نەیگاتێ، لەلایەکی تر وەسفی ئافرەت دەکاتو دەی بەستێتەوە بە کۆڕی تێکۆشانو ڕوو بە ڕووی مەرگ دەبێتەوە.

### ٣. نیشتمانپەروەری و نەتەوایەتی:

بابەتی هەستی نەتەوایەتیو سۆزی نیشتمانپەروەری لە هۆنراوەی شاعیرە کلاسیکییەکانی کوردی وەک { خانی، حاجی قادری کۆیی، نالی، سالم، ئەحمەد موختار جافو... }دیارە، دیلانی شاعیریش یەکێک بوو لەو شاعیرانەی، کە پەروەردەی بزوتنەوەی نیشتمانپەروەری و خەباتی ئازادیخوازانەی دوای جەنگی دووەمی جیهان بوو، هۆنراوەکانی دیلان ئاوێنەیەکی ڕوونی خەباتو بزوتنەوەی نەتەوەییو ئازادیخوازانەی گەلەکەمانە.

دیلان وەک شاعیرێکی شۆڕشگێڕی کورد تێکۆشانی گەلانی ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتینی، کە لە پێناوی سەربەستیدا خەباتیان دەکرد، بزوتنەوەکەیان دەبەستێتەوە بە خەباتی گەلی کوردستان.

دیلان لە ڕووی (کێشو سەروا)وە لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا کێشی برگە (پەنجە)و سەروای دێڕی مەسنەوەی بەکارهێناون، چونکە هەستی بە ڕەسەنایەتیو خۆماڵی کێشەکە کردووە، بۆیە گەڕاوەتە سەریان. دیلان جگە لەوەی شاعیربوو ئەستێرەیەکی گەشی درەوشاوەی ئاسمانی ئاوازو گۆرانی کوردی بوو، دەنگ خۆشو مەقام زانێکی کەم هاوتا بوو.

## شێخ مەحمودی زیندوو

لەکێ بپرسین سۆراخی ڕاستی ‌‌ ‌‌ دیارە نزیک تر هەر بەرانانە
بەرانان دەخیل دراوسێی دڵسۆز ‌‌ ‌‌ ئێستا ئەو بەرت کێی لا میوانە؟
هەواڵێ پرسە لە داری کەلی ‌‌ ‌‌ شێخ لەوێ ماوە یا لە سەیوانە؟
ئێستە سێبەری سەرجەستەی کفنی ‌‌ ‌‌ هەتاوی سوورە یا ئەرخەوانە؟
ئێستە پێخەفی نەرمو نۆڵی شەو ‌‌ ‌‌ بەردە یا خاکی کانی ئاسکانە؟
بەردە قارەمان لە جێی خۆی ماوە ‌‌ ‌‌ هەر لە دەربەندە یا لە پیرانە؟
ئێستە ئاو باریک وەک بوومە لەرزە ‌‌ ‌‌ هەر هەڵ ئەلەرزێ یا لە وەستانە؟
کوا شێخ؟ کوا نەوەی ئەحمەدی کاکی؟ ‌‌ ‌‌ کوا نەبەردەکەی ئەم نیشتمانە؟
بەرانان دیارە قوڕگت گیراوە ‌‌ ‌‌ چاوت لیخنی خوڕی گریانە
سەرت چەپۆکی کۆچی بێ وادەی ‌‌ ‌‌ شێخ خوولی داوە سستی فغانە
بەڵام بەرانـــــان گوێم لێ ڕاگرە ‌‌ ‌‌ من کوردم، کوردیش گەلە، ئینسانە
هەزار ئەوەندە بخرێتە بینی ‌‌ ‌‌ دەستی گەردوونو چنگی زەمانە
کورد شۆڕە سواری وەک شێخی بوو بێ ‌‌ ‌‌ سەر نەوی ناکا لە بۆ بێگانە

لە سەرەتاوە سێ دێر بۆ لەبەرکردن

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| شەو بەرد | : | ناوی گەڕەکە |
| کانی ئاسکان | : | ناوی کەڕەگە |
| بەردە قارەمان | : | ناوی شوێنە. |
| بەرانان | : | ناوی زنجیرە چیاییێکە |
| داری کەلی | : | گوندەکەی شێخ مەحمودە |
| دەربەندە | : | مەبەستی دەربەندی بازیانە |
| ئاوباریک | : | ناوی گوندە |
| لیخنی | : | شێلوی |



## وەرزی دووەم

# سەبری بۆتـانی

## (١٩٢٥- ١٩٩٨)ز

سـەبری بۆتانـی ل سـالا ١٩٢٥ز ل گونـدێ (دەلـو)ێ ل باژێـرێ (سـێرتێ) ڤـە لکوردسـتانا تورکیـا ژ دایـک بوویـە، ل مزگەفتـێو ل خواندنگەهـێ خواندییـە، بەلـێ دەسـت ژ خواندنـێ بەردایـە و کەفتییـە نـاڤ خەباتـا کوردینیـێ و خزمەتـا وەلات.

ل سـالا ١٩٤٦ێ هاتـە گرتنو دزیندانـا (موسـل) هاتـە زیندانکردن، هـەر لوێـرێ ژ نـو دەسـت بـە ڤەهاندنـا هەلبەسـتێکر، ل سـالا ١٩٦١ گەهشـییە ناڤـرێزێن شۆرشـا ئەیلـولا مـەزن.

بۆتانی چرایێ مەیدانا ئـەدەبو رۆشـنیرییا کوردییە، بەرهەمێن وی (پەخشـانو هۆنـراو)، ئەڤینداریـیا وەلاتو کوردینیـێو مرۆڤایەتیـێو براییـنیـێو وەک هەڤـی، بخـۆ ڤەگرتییـە، نـازکو ئاسـان هاتینـە نڤیسـین هەمـوو تەخێـن جڤاکـیو کۆمەلێـن خەلکـی تێبگەهـن.

ب درێژاهیـا ژیانـا خـۆ خەبـات بـۆ کـورد و کوردینیـێ کرییـە و هـەردەم پێنـوس و خامـێ وی دڤێیـرێ دا بەرهەمدار بوویـە و بـە دەیـان ڤەکۆلین و چیرۆک و پەخشان و بابەتێن فۆلکلۆری د گۆڤار و رۆژنامێن کوردیـدا بـەلاڤ کرییـە، ل ١٩٩٨/١٠/٢٥ ل باژێـری ئۆسـلۆی پایتەختـێ نەرویـج گیانـێ خـۆ ل دەسـتدایە و هـەر ل وێـرێ هاتییـە ڤەشـارتن.

**نمونـە:**

ئەڤ هەلبەستە ب هەلکەفتا دەست پێکرنا شۆرشا نو هاتییە نڤیسین.

عاشقان پەردە دڕاندن چەپو ڕاست
نامە ل پێ نامێ شاندن چەپو ڕاست
پەیکو مزگێنی دهاتن پێلو پێل
ب ئاوازەک نوو ستراندن چەپو ڕاست
جوتیارو ڕێنجبەرو پالان شەڤ و ڕۆژ
ژ دەمێ هەڤ درەڤانەن چەپو ڕاست
شلیپان دهاتن مەیدانێ کتو جۆت
وەک بازان شەپەڕ شەقاندن چەپو ڕاست
خورشیدو شێرو شاهینان ڕاهێلانێ
کۆزکو چەپەر شکاندن چەپو ڕاست
خوەش د خوەندن قەق بوو هەی قەقە بوو
کافر دخوونێ گەڤزاندن چەپو ڕاست
ئەڤینداران جانو دل دان دلستانێ
تەڤنا ژینەک نوو ڕاچاندن چەپو ڕاست
ترسو لەرزا ڤێ خەباتو کێڤە ڕاتێ
بەگو دوژمن لەرزاندن چەپو ڕاست
خوە پەرستان ئەڤ سەرو ئەو سەر لەیزتن
خوە ب دۆلارا وەرماندن چەپو ڕاست
تۆڤێ ڕکو کەربو کینا ڕەش ڕەشاندن
دوەلاتێ مەدە چاندن چەپو ڕاست
ئەڤ هەموو دەردو خەمو زۆرو ستەم
دوژمنا ل مە باراندن چەپو ڕاست

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| شلیپان | : | شەپول شەپول |
| کێفەڕات | : | خەبات |
| کتو جۆت | : | تاکو جوت |
| شەپەڕ | : | شاپەڕ |
| قەق بوو | : | دەنگی کەو، قاقبەی کەو |
| گەڤزاندن | : | گەوزاندیان |
| دخونێ | : | لە خوێندا |
| تەڤن | : | تەون |
| نامەل پێ نامەشاندن | : | نامەیان دوای نامە نارد |
| پێلو پێل | : | شەپۆل شەپۆل |
| سەر بباژێرێ | : | سەر بەشاری |
| ژ دایک بوویە | : | لەدایکبووە |
| خواندیە | : | خوێندوویە |
| دەست ژ خواندنێ بەردایە | : | دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە |
| کەفتیە ناڤ خەباتا کوردینییێ | : | کەوتووتە ناو خەباتی کوردایەتی |
| گەیشتیە ناڤ ڕیزین شۆڕشا ئەیلولا مەزن | : | گەیشتووتە ناو ڕیزەکانی شۆڕشی مەزنی ئەیلول |
| ئەڤیندارتیا وەلات | : | خۆشەویستی وڵات |
| وەک هەڤی | : | وەک یەکیی، یەکسانی |
| بخۆ ڤەگرتییە | : | گرتوویەتییە خۆ |
| ڤەکۆلین | : | لێکۆڵینەوە. |
| بەلاڤ کردیە | : | بڵاوی کردووتەوە. |

## مقداد مەدحەت بەدرخان



(مقداد مەدحەت بەدرخان) کوڕێ (میر بەدر خان)ە، بنەماڵا وان ب (ئازیزان) دهێتە ناسکرن کۆ ژ ساڵا (١٥١٤- ١٨٤٧) میرێن میرنشینا (بۆتان) بوون، ڕۆلەکێ گرنگ د چاندنا هەستێ نەتەوایەتی دناڤ میللەتێ کورددا هەبوو.

(میر بەدرخان) پارەک تایبەت ب ناڤێ خۆ بۆ میرنشینا (بۆتان) دەرخستبوو، سەرکێشی ڕۆژنامەڤانێن کورد (مقداد مەدحەت بەدرخان) دەمێ هەست پێکری کۆ مللەتێ کورد پێویستی خەباتەکا ڕۆشنبیرییە، ب فەر زانی ڕۆژنامەکا کوردی بەلاڤ کەت، لێ ژبەر کۆ سولتانێن عوسمانیان نە دهێلا ڕۆژنامەڤانیا ئازادی یا هزرو بیران هەبیتو زانینو ڕۆشنبیری دناڤ جڤاکێ کوردیدا بەلاڤ ببیت، مقداد مەدحەت نەچار بوو مشەختی (قاهیرە)ی پایتەختێ میسرێ ببیت و ڕۆژنامەکێ ب ناڤێ (کوردستان) ل وێرێ دەربێخیت.

ئێکەمین ژمارا ڕۆژناما (کوردستان) ل ٢٢ی نیسانا ١٨٩٨ێ ل (قاهیرە) دەرچوو کو ئەڤ ڕۆژە گهورینەکا گرنگ بوو د دیرۆکا میللەتێ کورددا. دڤێ ڕۆژێدا پەیڤا کوردی دگەل گوللا تڤەنگا خەباتکاران بوونە هەڤسۆز. سولتانێ عوسمانی د خوەست ڕۆژناما (کوردستان) هێشتا د لاندکێدا سەر ژێکەت داکۆ پێ نەگەهیتو نەبیتە ماکو نڤش ژێرا چێنە بیت، لێ خورتێن بەدرخانی ژ خوەستێن سولتانی ب هێزتر بوون لەورا شیان درێژیێ ب دەرچوونا ڕۆژناما (کوردستان) بدەنو دناڤبەرا ساڵێن (١٨٩٨- ١٩٠٢ ) (٣١) ژماران ل

چار باژێرێن جودا جودا دەرێخن، هەر ژمارەکێ (٢٠٠٠) دوو هەزار دانە ژێ چاپکرنو وەشاندنە کوردستانێو ب سەر خەلکێدا بەلاڤ دکرن ب مەرەما ڕۆشنبیرکرنا مللەتێ کوردو گرنگیدانێ ب زمانێ کوردی.

(مقداد مەدحەت)ی ژمارە (١- ٥) ل قاهیرە دەرخستن پشتی هینگێ توشی نەخوشیێ بوو، سولتانێ عوسمانی نەچارکر کۆ ڤە گەڕێنە ستەنبولێ، برایێ وی یێ بچوک (عەبدولڕەحمان پاشا بەدرخان) نەچار بوو بەرەڤ (جنیف- سویسرا) بچیتو ڕۆژناما (کوردستان) ژ ژمارە (٦- ١٩) ل ویرێ دەربێخت. جارەکا دی ڤەگەڕیا (میسر) ێو ژمارە (٢٠- ٢٣) ل (قاهیرە) دەرخستن، ژمارە (٢٤) ل (لەندەن) دەرخست، ژمارە (٢٥- ٢٩) ل (فۆلکستوون) ل ئینگلتەرا دەرخستن، ژمارێن (٣٠- ٣١) ل جنیڤ هاتن دەرخستن کۆ ژمارین داویێ بوون.

بابەتێ، ڕۆژناما (کوردستان) بخۆڤە گرتین (سیاسی، دیرۆکی، جڤاکی، ئایینی... هتد) بوون ژمارا داویێ (٣١) ل (١٤ی نیسانا ١٩٠٢) دەرچوویە.

## پارچەکا نڤیسینا مقداد مەدحەت بەدرخان

د ئیکەمین ژمارا ڕۆژناما (کوردستان)دا بەلاڤ بوویەو تیدا مەرەما دەرخستنا ڕۆژناما کوردستان دیار دکەت، بێ دەستکاری تنێ ڕینڤیس هاتییە گهۆرین.

**( سەد هزار شوکر و حەمد ژ خودێ تەعالارە ئەم موسلمان خەلق کرنو دزانینا عیلمو مەعریفەتێ دە هشو زەکادا مە. دەرحەقا عەلماندنا عیلمو مەعریفەتێ ڕە گەلەک ئایەتێن جەلیلەو ئەحادیسێن شەریف هەن، دونیایێ دە چقاس موسلمان هەبن د گوندو باژێرێن هەمیادە مەکتەبو مەدرەسەو**

**جەریدە هەن، دوونیایێ دە چ دبەو چ نابە جەریدە دنڤیسن حەیفا من تیت ژ کورداڕە کورد ژ گەلەک قەوما زێدەتر خودێ هشو زەکانە، جامێرن دبونێن خوە دەڕاستو قەوی نە، خورتـنو دیسا وەکە قەومێن دی نەخوەندانە، نە دەولەمەندن، دوونیا یێ دە چ دبە جیرانێ وان موسقوف چاوەیە وێ چ بکە نزان لەوما ڕیا خودێ دە من ئەڤ جەریدەیاها نڤیسی ب ئیزنا خودێ تەعالا پاش نهۆ دهەر پازدە ڕۆژا دە جارەکێ ئەزێ جەریدەکێ بنڤیسم، ناڤێ وێ من کریە (کوردستان) دڤێ جەریدێ دە ئەزێ بەحسا قەنجیا عیلمو مەعریفەتا بکم. ل کو دەرێ مرۆڤ دعەلمە، ل کو دەرێ مەدرەسەو مەکتەبێن قەنج هەنە، ئەزێ نیشا کوردا بکم، ل کودەرێ چ شەڕ دبە دەولەتێن مەزن چ دکن چاوە شەڕ دکن تجارەت چاوە دبە، ئەزێ هەمیا حیکایەت بکم هەتا نهۆ کەسێ جەریدەک هولێ نەنڤیسییە ئەڤ جەریدە یا منا یا ئەولییە، لەو ما وێ گەلەک کێمایی هەبێت، ئەز هیڤی دکم کێمایا جەریدێ ژ من ڕەبنڤیسن هەمی تشت وەکی نوو چێ دبن کێمن، (پاشی هینگێ دچە دکەوە ڕێدە) ئەڤە ئێدی ئەزێ دەست بە مەقسەدێ بکم)).**

٢. هەروەها لە ژمارە (٣)ی ڕۆژنامەی (کوردستان) کە لە ١٨٩٨ز لە میسر دەرچووە، (مقداد بەدرخان) دەنووسێت:

**((عالمەک ژ سۆرا هەبی سالا دی وەفات کر ڕەحمەتا خودێ لێ بە، خودێ گونەهێن وی بغەفرینە، ناڤێ وی (حاجی عەبدولقادر) بی، ئەڤ مرۆڤ ساغیا خوەدە گەلەک خەبتی دەرحەقا عەلماندنا علمو مەعریفە تێڕە، گەلەک بەیتو ئەشعارێن کرمانجی دنڤیسی، ڕێ دکر ولاتێ خوە سۆرا، عەزمانێ وی عەزمانێ سۆرایە لۆما کورد حەمی ڤی عەزمانی نزانن، پشتا کتێبا مەمو زینی دە بخەتێ دەستێ خوە هن بەیت نڤیسینە، تەبەروکەن من ئەو ئەبیات لڤی جەریدەییدە بنڤیسین)).**

# واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| دهێتە ناسکرن | : | دەناسرێت |
| سەر کێش | : | پێڕەو |
| ب فەر زانی | : | بەگرنگی زانی (بە پێویستی زانی) |
| نە دهێلا | : | نەیان دەهێشت |
| جڤاک | : | ئەنجومەن |
| مشەخت | : | دەربەدەر |
| ل وێرێ | : | لەوێ |
| دیرۆک | : | مێژوو |
| هەڤسۆز | : | هاوسۆز |
| سەر ژێکەت | : | سەری ببڕێت |
| نک | : | داک |
| نڤش | : | ڕەگەز |
| خورت | : | دلێر |
| خوەست | : | ویست |
| ژ سۆرا هەبی | : | لە سۆران هەبوو، مەبەستی ناوچەی سۆرانە |
| سالا دی | : | ساڵی پێشوو، ساڵی ڕابوردوو |
| ساغیا خوەدە | : | لەژیانی خۆیدا، کاتێ کە ساغ بوو |
| گەلەک خەبتی | : | زۆر (گەلێک) خەباتی کرد |

| وشه | | واتاکەی |
|---|---|---|
| رێ دکر | : | دەینارد، رەوانەی دەکرد |
| عەزمانێ وی | : | زمانی ئەو |
| لۆما | : | چونکە، لەبەر ئەوەی |
| حەمی | : | هەموو، هەمی، گشت |
| هن بەیت نڤیسینە | : | هەندێک بەیت یا شیعری نوسیووە |
| لەورا | : | بۆیێ، ژبەر هندی |
| شیا | : | توانی |
| ژێ | : | لێی |
| ب هەروەیی | : | بە خۆڕایی، بێ پارە |
| مەرەم | : | ئامانج، مەبەست |
| چقاس | : | چەند |
| لەکو؟ | : | لە کوێ؟ |
| چاوە | : | چۆن |
| نوو | : | نوێ، تازە |
| دچەو دکەوە ڕیدە | : | دەچێتو دەکەوێتە ڕێ |



# شاكر فەتاح
## (١٩١٤- ١٩٨٨) ز

ناوی (شاكر كوڕی فەتاحی كوڕی ئەحمەد)ە، لە ساڵی (١٩١٤)ز لە شاری سلێمانی لەدایكبووە، لە بنەماڵەیەكی خوێندەوار پەروەردەكراوە، لە سەرەتای منداڵیدا چووەتە بەر خوێندن لە حوجرەی فەقێیان، لە دواییدا چووەتە قوتابخانەو سەرەتایی لە سلێمانی تەواوكردووە، دواناوەندیو كۆلیجی مافی لە بەغدا تەواوكردووە،

لە شەوی ١٨-١٩٨٨/٣/١٩ گیراوەو لە ناوەڕاستی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨ز گوللە باران كراوەو گەیشتۆتە ڕیزی شەهیدانی كوردستان، شاكر فەتاح یەكێكە لە نووسەرە ناسراوو ناودارەكانی كورد، كە لە ماوەیەكی گرنگو پڕ ڕووداو لە بزووتنەوەی ڕۆشنبیریو ئەدەبیدا ڕۆلێكی گەورەی هەبووە، خزمەتی فرە مەزنی نەتەوەكەی كردووە، چونكە بەردەوام خامە ڕەنگینەكەی بۆ مەبەستی وشیاركردنەوەی میللەتەكەی خستۆتە كار، لەم بوارەدا یەكێكە لەو نووسەرانەی كە بەهۆی بەرهەمەكانییەوە وای كردووە بچێتە ڕیزی پێشەنگانی ئەو نووسەرانەی كە بەرهەمیان زۆرە. ئەوانەی كە زۆر كاریان لە شاكر فەتاح كردووەو جێ پەنجەیان لەسەر كەسێتی ئەو دیارە مامۆستا (محەمەدەمین زەكی، توفیق وەهبی، حوسین حوزنی موكریانی) بوون، هەروەها هۆنراوەكانی حاجی قادری كۆیی زۆر كاری تێكردووە،

لەگەڵ ڕۆژنامەکانی (بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، ئومێدی ئیستیقلال، بانگی هەق).

شاکر فەتاح لە پیرەمێرد فێری نووسین‌و خوێندنەوەی کوردی بووە، کە چۆتە لای هانیداوە بۆ کۆکردنەوەی وشەی کوردیی پەتی، زۆرجار بە دوای ئەم وشانەدا زۆر شوێن گەڕاوەو تۆماری کردوون‌و بۆی بردووە.

شاکر فەتاح لەگەڵ دەست بەکاربوونی وەکو (قایمەقام) لە شارۆچکەکانی کوردستاندا، خەریکی دەرکردنی ڕۆژنامەو شانۆگەری‌و کردنەوەی کتێبخانەو بەخشینی کتێب بووە، کە ئەمەش دەرفەتێک بووە بۆ زیاتر گەڕان‌و هۆگربوونی بە دونیای ڕۆشنبیری تا دوا چرکەکانی ژیانی، کتێب نزیکترین هاوڕێی بووەو بێ کتێب‌و خوێندنەوە هەڵینەکردووە. لەگەڵ گەشانەوەی ئەدەبیاتی کوردی لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا، شاکر فەتاح بە جۆش‌و خرۆشەوە ڕۆڵێکی باشی لە بزوتنەوەی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و ڕۆژنامەگەریی کوردی گێڕاوە. لە گەلێ بواری جیا جیاو مەیدانی تری نووسیندا قەڵەمەکەی وشکی نەکردووە، دەتوانین بڵێین لە هەندێک بواردا یەکێکە لەو پێشەنگانەی بەرهەمیان لە مەیدانی وتارو چیرۆک‌و گەشتنامەو ژیاننامەدا، ئەدەبی کوردی ڕازاندۆتەوە.

## شاکر فەتاح لە گەلێ بواردا بەرهەمی ئەدەبی هەبووە، لەوانە:

١. **هۆنراوە:** زۆربەی هۆنراوەکانی لە دەوری مەبەستی کۆمەڵایەتی و وەسف و دڵداری و نامەی شیعری دەسوڕێنەوە، پرسی هەژاری و زۆرداری و نەخوێندەواری و دواکەوتوویی کۆمەڵی کوردەواری

و وەسفی سروشتی کوردستانو ئافرەت بە زەقی لە ناوەڕۆکی هۆنراوەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە.

٢. **وتار:** لە سەرەتادا گرنگی بە وتاری ئەدەبی داوە، لە دواتردا زیاتر گرنگی بە وتاری کۆمەڵایەتی داوە، بە قوڵی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکانی خستۆتە ڕوو، ئەوەندەی پێیکرابێ چارەسەری بۆ دۆزیونەتەوە، هەروەها هەندێک وتاری سیاسیشی نووسیوە.

٣. **چیرۆک:** کۆمەڵێک چیرۆکی نووسیوە، لە ناوەڕۆکیاندا باسی گەلێک دەردی کۆمەڵایەتیو گەلێک دیمەنی دواکەوتنی کۆمەڵی کردووە.

٤. **چیرۆک بۆ منداڵان:** کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵانی نووسیوە، هەروەها چەند چیرۆکێکی منداڵانی وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردی.

٥. **ژیاننامە:** چەند ژیاننامەی نووسیوە وەک (ئاوێنەی ژینم، خەباتی ڕۆشنبیران، یادنامە).

٦. **گەشتنامە:** چەند گەشتنامەیەکی نووسیوە وەک (گەشتی پێنجوین، گەشتی شارباژێر، گەشتی سرۆچک، گەشتی هەڵەبجەو هەورامان).

٧. **گفتوگۆ:** لە نامیلکەی ئاهەنگی ڕۆشنبیراندا سێ گفتوگۆی جۆراو جۆری لە بارەی (کۆمەڵایەتی، مێژووی، ئایینی) بڵاوکردووتەوە.

٨. **لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان:** لە بەرهەمی ئەم شاعیرانەی کۆڵیوەتەوە (ئەحمەدی خانی، داماوی موکریانی، زێوەر، بێکەس، حاجی قادری کۆیی، مەلا کاکە حەمە).

٩. **وەرگێڕان:** لە بواری وەرگێڕاندا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە، گەلێک کتێبی نووسەرە ناودارەکانی جیهانی وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردی.

شاكر فەتاح نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزبوو، کوردایەتیو پرسی نەتەوەکەی، ئامانجی پێگەیاندنی میللەتە ژێر دەستو چەوساوەکەی تاکە مەبەستو ئامانجی بووە. خاوەن هەڵوێست بووە، لە ڕووی ناهەقو زولمو نا عەدالەتیو دیاردەی نا بەجێ وەستاوە، بێدەنگ نەبووەو سەری شۆر نەکردووە لە ئاست هەڕەشەو چاو سوور کردنەوەو تۆقاندن. ئەم هەڵوێستە بە درێژایی تەمەنیو هەر لە خۆناسینەوە لەگەڵی گەورە دەبێتو سەرەنجامیش دوا هەڵوێستی بە شەهیدکردنی دا.

**نمونەیەک لە پەخشانی شاکر فەتاح**

## بەرخەکە!

کوڕەکەم لە تەمەنی دوانزە ساڵاندا بوو، ڕۆژێک هەستیکرد بە ئاوارەییو تەنیایی، ئەگەڕا بۆ شتێک دڵی خۆی پێ خۆش بکات، خۆشەویستیو دڵسۆزیو چاودێریی خۆی تیا بەخت بکات، نا چاری کردم بەرخۆڵەیەکی بۆ بکڕم لە مەڕسەربڕێک (قصاب) زۆری پێ نەچوو کوڕەکەم بوو بە دۆستێکی گیانی بەگیانیی بەرخەکە، بەرخە بەسەزمانەکە وا هۆگری بوو بوو کە کوڕەکەم ئەڕۆیشت ڕای ئەکرد بە دوایا، لێی ئەچووە پێشەوە، خۆی تێ هەڵ ئەسوو، یاری لەگەڵ ئەکرد، کوڕەکەمی لە جێگای دایکی دانابوو، ئەو دایکەی کە خواپەرستیو ناپەسەندی نەوەی ئادەم لەوی جوێ کردبووەوە!

هەر چەند بەرخەکە بە تەنیا بمایەوە ئەیباڕاند: کوڕەکەمی بانگ ئەکرد پێویستیی جێ بەجێ بکات، هاودەمی بکات، دڵی خۆش بکات، جا کوڕەکەم چەند بەختیار بوو بوو بەو بەرخە بەسەزمانە!

بەرخەکە هەموو کاتێکی، هەموو بیرەورییەکی کوڕەکەمی داگیرکردبوو، کوڕەکەم ئەوەندەی بە تەنگ دڵی ئەو بەرخەوە بوو، بە تەنگ دڵی کەسی ترەوە نەبوو!

بەڵام بەلای منەوە باڕاندنی بەرخەکە لە بانگ کردنی کوڕەکەم زۆرتری تیابوو، شتێکی گرنگ تری تیا بوو، دیلیی‌و بەندەیی‌و بێ دەسەڵاتیی بەرخەکەشی ئەنواند بەرامبەر بەهێزێکی وا کە نەی ئەتوانی بەرەنگاری بکا! بەرخەکە لە خۆشەویستی‌و دڵسۆزی‌و چاودێریی دایکی بێ بەش کرابوو، لە خۆشەویستی‌و دڵسۆزی‌و چاودێری کوڕەکەم دڵنیانەبوو، بەشتێکی دەست کردی ئەدایە قەڵەم، ئەو حەزی ئەکرد بچێتەوە لای دایکی، حەزی ئەکرد سەربەستی خۆی دەست کەوێتەوە، لە زۆرداری دوور کەوێتەوە، لەبەر ئەوە هەستی بە ترس ئەکرد، ئەترسا لەوەی شتێکی بەسەر بێ! لە ڕاستیدا بەرخەکە بە هەڵە نەچوو بوو...

چۆن ئەبوو باوەڕبکا بە دۆستایەتیی کوڕەکەم‌و ئەو مەڕ سەربڕەی کە ئەو بەسەزمانەیان لەدایکی خۆی کردبووەوە؟!.. بەرخەکە بە دڵ هەستی ئەکرد بە جیاوازییەکی گەورە لە ناوەند خۆشەویستیی دایکی کە پڕ بوو لە دڵسۆزی‌و خۆ بەخت کردن‌و خۆشەویستیی کوڕەکەم‌و مەڕسەربڕەکە کە پڕ بوون لە خۆ پەرستی!

لەبەر ئەوە چەند بە تەنها بمایەوە ئەیباڕاند، ئەلالایەوە چونکە خۆی لەتەنگ‌و چەڵەمەدا ئەدی، دەترسا لەوەی لەناو بچێ، وا تێ گەیشتبوو کە ئەگەر بەهۆی کەم تەرخەمیی کوڕەکەمەوە لەبەر بێ ئاوی‌و بێ خۆراکی نەمرێ، دوور نییە سەگ‌و گورگ لە پەرژینی خانووەکەوە باز بدەنە ژوورەوە پەلاماری بدەن بیخۆن، یاخود دزو

درۆزنو زۆردار بەشەو بیدزنو سەری بڕنو گۆشتەکەی بفرۆشن!

بەڵکو بۆی هەیە کوڕەکەم خۆی سەری بڕیو بیبرژێنیو بیخوا، ئەمە ڕاستە کوڕەکەم دۆستێتی، دڵسۆزێتی، بەڵام تەقو ئارەزووی چووە سەر گۆشتە ناسکە خۆشەکەی؟! کێ ئەڵێ سەری نابڕێ؟ بۆ چ هەموو ڕۆژ هەزاران بەرخی وەک خۆی سەر نابڕێن بۆ خۆشیی بن دانی کوڕەکەمو هاوتای کوڕەکەم؟!..

لەبەر ئەوە بارە باری ئەو بەرخە لە باوکو دایک براوە کڵۆڵە، کە وەک هاوارێکی بێ دەسەڵاتو بێ چارانم ئەهاتە بەر گوێ، کە سێ دارە لە نزیکیانەوە هەڵخرابێ، دڵمی ئەسوتاند، جەرگمی ئەبرژاند!

تەنانەت ئەوەشی لەبیر ئەبردمەوە کە کوڕەکەمو هەموو خێزان نازیان ئەکێشاو چاودێرییان ئەکرد! بەڵام منیش بە هەڵەدا نەچوو بووم، زۆری پێ نەچوو دۆستایەتیو نازکێشانو دڵسۆزی بەرانبەر بەرخەکە لەبیر کوڕەکەمو خێزان چووەوە کاتێکم زانی بەرخی بەسەزمانیان داوە بە زەویداو ئەیانەوێ سەری بڕنو گۆشتەکەی بکەن بە چێشت کە لەسەیرانێکا دەرخواردی چەند میوانێکی زۆرداری وەک خۆیانیان بدەن! باش بوو فریاکەوتمو بەرخی بەسەزمانم لەدەستیان ڕزگارکرد!...

گەلێک لە نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتیش داخەکەم لەو بەرخە بەسەزمانە ئەکەن! ئەوانیش هەر چەندە سەرۆکە خۆ پەرستەکانیان خۆشەویستییان بۆ ئەنوێننو یارمەتییان پیشان ئەدەنو چاودێرییان پێشکەش ئەکەن...

بەڵام هەی هوو! تازە چاویان کراوەتەوە، قەت چەواشە نابن، لە ترسی گیانی خۆیان ناچارن هەر هاوارو فریاد بکەن تا خوا دەرگایەکی ڕزگاربوونیان لێ ئەکاتەوە!

## سەرچاوەکانی هەردوو بەشی ڕێزمانو ئەدەب

١. ڕێزمانی کوردی- جێناو- د. ئاو ڕەحمانی حاجی مارف.
٢. ڕێزمانی کوردی- ئاوەلکردار- د. ئاو ڕەحمانی حاجی مارف.
٣. ڕێزمانی کوردی- نوری علی امین.
٤. دەستور زبان پێنج استاد- رشید یاسمیو هاوڕێکانی- بە فارسی.
٥. ڕێزمانی کوردی- صادق بهاو الدین.
٦. دستور زبان فارسی- دکتور نادر و زین پور.
٧. مەمو زین لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی علی فەتاح دزەیی.
٨. دیوانی حاجی قادری کۆیی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی سەردار حمید میرانو کریم شارەزا.
٩. دیوانی پیرەمێرد- محمد رسول هاوار.
١٠. باغێ کوردا- دیوانی ئەحمەدێ نالبەند- کۆمکردنو تویژاندنا گە مائی.
١١. دیوانی گۆران- چاپی ١٩٨٠- بەغدا.
١٢. کاروانی شیعری نوێی کوردی- ١٩٧٨- کاکەی فەللاح.
١٣. دیوانی دیلان- ١٩٦٩.
١٤. دیلان شاعیرو ئازادیخواز- ١٩٨١ دلشاد عەلی.
١٥. نوبهارا ئەحمەدێ خانی- تویژاندن حمدی عبدالمجید السلفی- بەغدا.
١٦. مجله پقافه الهند- المجلد الخامس- سبتمبر ١٩٥٤- العدد الپالپ.
١٧. الاسگوره والتاریخ فی التراپ الشرقی القدیم.
١٨. زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی- د. عزالدین مستەفا رسولو هاوڕێکانی.

## بەشی خوێندنەوە

١. دوازدە سوارەی مەریوان
٢. نرخی سەربەستی
٣. ڕەواندز
٤. دارگوێز
٥. بەرزە بوون
٦. گورگو ئێستر
٧. سەر هڵدان
٨. هونەری شانۆگەریی پێویستی بە هەرەوەزە.
٩. نامیق کەمال
١٠. هەژاری
١١. ئەز دزانم ئاڤ ل سەر چ ڕا دچت بەلێ نابێژم
١٢. ژیانی کۆچەر
١٣. قازی محەمەدی پێشەواو کۆماری کوردستان
١٤. ژیانی ئەمڕۆم دەفرۆشم بۆ کڕینی نانی سبەی

# دوازده سوارەی مەریوان

شـار قەڵاچۆلانـە، حوکمـڕان ئەحمـەد پاشـای گەورەیـە کـە بـە (شـا غـازی ئەحمـەدی لەشکر شکێن) بەناوبانگە، شـیرو قەڵغان چەکی دەسـتی سـوار چاکانـی مەیدانـە، ئێـواران لـە کەنـار چەمـی قەڵاچـوالان دیـوان دەگیـرێ، پیـاو ماقـوڵان کۆمـەڵ لـەو گـوێ ئـاوە دادەنیشـن.

ئێوارەیـەک پیاوێکـی بەشـکۆی ئەسـمەر، ڕیشـێکی سـپی تەنکی هێشـتبووەوە بـە ڕێـدا دەهـاتو لۆزەندەرێکـی کەڵەگەتـی چوارشـانە لـە پشـتەوە بـوو، تـازە خەتـی سـمێڵی دانابـوو چـاوی وەک ئەسـتێرەی سـیوەیل دەدرەوشـایەوە، کـە گەیشـتە پێشـەوە بـە شـەرمەوە هەواڵـی پاشـاو سـەلیم بەگـی مامیـان پرسـی، کـە ئەحمـەد پاشـایان پیشـاندان زۆر بەڕێزەوە سـڵاویان کـردو چوونـە پێشـەوە ئەحمـەد پاشـا هەواڵـی دەپرسـێ تـا بزانـی کێیـە، ئەویـش خـۆی دێتـە زمـانو دەڵـێ: پاشـام مـن مـەلا هەمـزەی ئەفغانیـم ئـەو لاوەش (ئەکـرەم) ی بچووکتانـە، سـەودای دلاوەریو چەکبازی لـە کەللـە دایـە ناوبانگی زەبرو زەنگـی سـەلیم بەگی بیسـتووە بەڵێنـی بـە خـۆی داوە ئەگـەر سـەلیم بـەگ بتوانـێ شـیرەکەی هەڵسـوڕێنێو دایوەشـێنێ، هەتا ماوە نۆکەری دەکات، ئەحمەد پاشـا، کە بینـی کـوڕە تـا دەسـت هەڵبـڕی کەڵەگـەتو چـوار شـانەیەو شیرەکەشـی نیـوە، خێـرا فەرمانـدەدات کـە سـالم بـەگ ئـاگادار بکـەن میوانـی هاتـووە پـاش تاوێـک سـالم بـەگ پەیـا دەبێتو بەخێرهاتنـی میوانـەکان دەکات، کە چـاوی بـە شـیرەکەی ئەکـرەم دەکەوێـت زۆر دڵـی تێـی دەچـێو یارمەتـی وەردەگرێـت کـە سـەیری بـکات، هـەر کـە دەسـتی دەداتـێ زۆر بـە ئاسـانی لـە کالانـی دەردەکێشـێو بـەم شـان بـەو شـاندا هەڵـی دەسـوڕێنێو هەڵـی دەدات بـە ئاسـماندا.

که ئەحمەد پاشا بینی ئەو شیرەی دلاوەرێکی ئەفغانی پێوەی دەنازێت دەیگوت کەس ناتوانێت ڕایوەشێنێت، کەچی وا سەلیم بەگ بە ئارەزووی خۆی یاری پێدەکات، وەک گوڵ گەشایەوە ئەکرەمیش زۆر شادمانبوو، کە زانی وا تووشی گەورەی خۆی هاتووە، سەلیم بەگیش بە پاشای گوت: ئیتر ئەمانە دەستە برای منن، ئەمان بوون بە هاورێی گیانی بەگیانی. ڕۆژان هاتو ڕۆیشت، کاتی ڕاوە بەراز هاتە پێشەوەو لەسەر هاتنی کوێخای (بەکراوا)و (گوڵعەنبەر) بۆ لای پاشاو هاوارو دادیان لەدەست زۆری بەراز کە هیچیان بۆ نەهێشتوونەتەوە. پاشا گوتی: کوان شیر وەشێنەکان هونەر ئەوە نییە لەبەر دەمی ئێمەدا هەڵیانسووڕێنن، سەلیم بەگ تێگەیشت، کە پاشا لەگەڵ ئەوانیەتی بۆیە ڕوویکردە هەردوو کوێخاو گوتی: ئێوە لە پێشەوە بڕۆنەوە، سبەی ئێوارێ خوا یار بێت لاتان میوانین، ئیتر لە دیوەخان هەڵساو لەگەڵ ئەکرەم ڕوویکردە ماڵی خۆیانو ناردی بە شوێن ئەم پیاوانەی خوارەوە:

**١. جوامێر ئاغای ڕەنگینە**
**٢. ئاغال ئاغای سیوەیل**
**٣. زەینەڵ بەگی مەسرەف**
**٤. مەحمود بەگی قەدیمی باش چاوەش**
**٥. دارا ئاغای میرەدێ**
**٦. فرامرزی زەنگنە**
**٧. سوار ئاغای بلباس**
**٨. مەمەند ئاغای میراو دەلی**
**٩. شاپور ئاغای بەختیاری**
**١٠. زلاڵ ئاغای مەرگەیی**
**١١. میران بەگی وەڵەدبەگی**
**١٢. چەلەبی قەدیمی هەمەوەند**

لەم یەکە یەکە سوارانە دوازدەی جەنگاوەری دلێری کۆکردەوەو پێیگوتن بەیانی زوو بەفێنکی سوار دەبین لێرەوە، لە دۆلی گەلاڵەوە بەسەر ئاوی سبحانئاغادا لە بنەی سەی سادقەوە ڕاوە بەرازی لێدادەبەستین تا دەیان ڕەوێنین بۆ خوار بەکراوا، بەرە بەیان دوازدە سوارە کۆبونەوەو کەوتنە ڕێ بۆ ڕاوە بەرازی خۆیان. پاش ڕۆیشتنی ئەم سوارچاکانە زۆری پێنەچوو دەنگوباس گەیشتە ئەحمەد پاشا کەوا لەشکری ئێران گەیشتوونەتە مەریوان، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەم دەنگوباسەدا شا فەرمانیدا لەشکر ئامادەکرا وخۆشی سواربوو ڕوویکردە سوپاو بە دەنگێکی بەرز گوتی:

تا ئەم سەرە سەر بێت پشت ناکاتە دوژمن، سواربن ڕۆژی مەیدانە ئینجا کەوتنە ڕێ ڕووەو باسکەدرێژی قەیماسەن پاش ماوەیەک ڕۆیشتن شا بینی وا دەستە سوارێک دیارن، مامەند ئاغای میراودەلیو سوار ئاغای بلباس، کە لەپێشەوە دەڕۆن سەلیم بەگیش شیری حمایل کردووەو دەستی چەپی بە جلەوەوەو دەستی ڕاستی لەسەر کەمەربەندی قەبزە نوشتەیی داناوەو بەسەر بەرزیەکەوە چاوی بڕیوەتە تاریدەر وەک بیەوێ بە تیشکی چاوەکانی ئەو کێوە هەڵکەنێو بدا بەسەر دوژمنا، جوامێر ئاغای ڕەنگینە، کە دەڵێن پڵنگی چنگ بە خوێنە قلیانی تێکردووەو دووکەڵی قەندەکەی وەک باقە سمێلی لەم لاو لەو لای سەریەوە با دەیشەکێنێتەوە،

کە ئەحمەد پاشا ئەم بەزمو ڕەزمو خۆشییەی لەم دەستە سوارەدا بینێ بانگدەکات تەپڵی شادی لێبدەنو ئەڵێ ئەمەی دەیبینم نیشانەی سەرکەوتنە، نەقارەچی دەستدەکەن بەگرمو هوری تەپڵو ئاوازی تەپڵی شادی بەو فێنکی بەیانییە ئەیدا لە شاخی (کەوتو) کە

سەلیم بەگ گوێی لە دەنگی ئەم تەپڵە دەبێت بە خۆیو سوارەکانییەوە لەسەر ڕێگەدا دەوەستن، کە پاشا دەگاتە ڕاستیان پێیان دەڵێت: ئەی شۆرە سوارینە هەر وەک پێشکەوتن دەخوازم هەر پێشکەوتوو بن دەبێت. بیستبێتتان لەشکری ئێران هاتۆتە سەرمان وا لە مەریوانە، دەبڕۆن ئێوە پێشەنگ بن ئێمەش، کە خەیمەو بارەگامان ئامادە بوو دەتان گەینێ، پشت بە یەزدان بۆ ئێوارێ هەموو دەگەینە سەریان.

سەلیم بەگ سەرکردەی دوانزە سوارە وەردەگرێو ئاوزەنگی پیادا دێنو دەیکەن بە تۆزو تێدەپەڕن، دەمی ڕۆژئاوا نزیک بە لەشکری ئێران لە نەدیوی بۆسە دەخۆن، نزیک بانگی شێوان سوپای پاشاش سەرەتای دەردەکەوێت پاشان سەلیم بەگو ئەکرەم لەسەر ئەوە پێکدێن، کە تا سەر لە ئێوارەو لەشکری ئێران شپرزەی نانو ئالیکن دەستی خۆیان بوەشێنن چونکە ئەوان دوانزە هەزارو دوانزە سوار بەراوورد ناکرێنو ناخرێنە دوو تای تەرازووەوە، کە ڕۆژیش بووەوە پێیان دەزانن، لەبەر ئەوە سەلیم بەگ دەنێری دوانزە تەپڵ دەهێننو بە قەڵۆزی زیندا دای دەبەستنو ڕوو دەکەنە لەشکری ئێران ئینجا جوامێر ئاغای ڕەنگینە ڕوویکردە سەلیم بەگ گوتی:

دەبێت تا نزیک قەڵا وا برۆین، کە بەدیمان نەکەن لەوێ بێدەنگ مۆڵ بخۆین تا شەو بەسەرا دێت ئەوسا بەندەو ئەکرەمو چوار سوار یەک دوو سەعات لە پێش شەبەیخوندا دەوری زرێبار بدەینەوە، یەکێکمان لە (دۆلاش)و (تەی) یەوە دووەممان لە (بەیز)ەوە سێیەممان لە (موسەک)ەوە چوارەممان لە (داسیران)ەوە ئامادەبن تا منو ئەکرەم دەگەینە کێوەکەو پشتیان لێدەگرین ئەوسا کە دەنگی تەپڵی ئێمەتان بیستو نەعرەتەی ئەکرەمتان هاتە گوێ خۆت لە پێشەوە

بەڕێی (گوڵان)دا لە ناو جەرگی دوژمنەوە هەر شەشتان هەڵمەت بەرنو بدەن بە سەریاندا ئەوسا ئەو لەشکرە زۆرەی ناردوویانەتە سەر کێوەکە بڕ دەبنو کە ئەو هەرایە ببیستن نایەنە خوارەوە، لەسەر خوارەوە لەسەر ئەم ڕاو تەگبیرە کە ئەکرەمو جوامێر ئاغا گەیشتنە شوێنی خۆیان،

جوامێر ئاغا بە دەنگە خۆشەکەی موناجاتێکی بە دەنگی بەرز خوێندەوە ئەکرەم جۆشی سەندو ڕاستبووەوە سەر ئاوەزەنگیو نەعرەتەیەکی کێشا، بە جاریێ ئەوە دەنگیدایەوە، خورپە کەوتە دڵی لەشکری ئێرانەوە بە جاریێ پەشوکانو هاتن بەیەکا، ئەو شوێنەی ئەمانی گەیشتبوونێ تیر هاوێژیێ لە سەلیم بەگەوە دوور بوو، کە دەنگی ئەکرەمی هاتە گویێ ئەویش لە خۆشیاندا نەعرەتێکی کێشا،

هەردوو نەعرەتە بەرامبەر بە یەک دەنگیان دایەوەو موژدەی سەرکەوتنیان گەیاندە گوێی ئەحمەد پاشا، ئینجا سەلیم بەگ دای لە تەپڵو کردی بە سەفرە و گەڕا هەر چەند سێ تەنگە ئاوزەنگی بە ئەسپە ڕەشدا دەهێنا کوڕەی ئەسپو تەقەی ناڵەکانی ئەو ناوەیان دەهێنایە جۆش ئەحمەد پاشا چووە سەر گردەکەی نزیکی، گوێیگرت هەر لە (کانی سانان)ەوە بە دەوری لەشکری ئێراندا گرمەی تەپڵی نەقارەخانەی خۆیو نەعرەتەی دوانزەسوارە دێ ئینجا پاشا بانگیکردە باشچاوش (خالد بەگی مێرەدێ )و دارا ئاغا دەوری لەشکر بدەن ڕێی ڕاکردن لە لەشکر بگرن وا شکان خراپیش شکان شپرزەن نازانن ڕوو بکەنە کوێ ئینجا خالدبەگ کەوتە بەر لەشکرو بانگیکرد:

کوڕینە شەوێکەو ئەم شەو لەو ڕۆژەوە، کە ئەم خاکە دروست بووە تا ئێستا شەرێکی کەی وای تیا نەکراوە، سەلاحەدینی قارەمان

بـە لەشـكرێكی گـەورەوە ئینجـا سـەركەوتنێكی وای دەسـت كەوتـووە، ئێمـە بـە دوانـزە سـوارەوە لەشـكری ئێرانمـان شـپرزە كـردووە، فیـدای دەسـتو شمیشـێرو شـانو باهۆتـان بـم.

دەشزانم زۆر كفتی رێگەنو بێ پشوو سەررەو لە قەڵاچۆلانەوە، گەیشـتوونەتە ئێـرەو مانـدوو و برسـین بـەڵام پیاوەتـی ئەمانـە لەبیـر دەباتـەوە شـەیپورچی، دەی فیدای كەرناكەت بم پێشكەوە، كور گەل وا رۆیشـتم دوامكـەون ئەمـەی گـووتو ئاوزنگی پیاهێنا، ئینجـا غوڵغولـەی تەپڵو گـورەی نەقـارە تێكـەڵ بـە ناڵـەی (سـەردەركەو مـاڵ پرسـیار)ە بـوو، بەڕاسـتی سـوارەی بەبـە ئـەو شـەوە كارێكیـان بـە لەشـكری ئێران كـرد تـا دێـر زەمـانو پشـتاو پشـت بـە داسـتان دەگێرێتـەوە، مەردانـە لـە شـوێنی خۆیـان هەڵیـان كەندنو كوشـتارێكی زۆریـان لێكـردن، ئێتـر لەشـكری ئێـران خـۆی بـۆ نەگیرایـەوە چـادرو بـارەگاو نـانو خوانـی پوخـتو تەمیزیـان بەجێهێشـتو ئەحمـەد پاشـا بـە لەشـكرەكەیەوە ئـەو شـەو میوانـی دوانـزە سـوار بـوون لەسـەر خوانـی بەجێمـاوی لەشـكری شـكاوو ڕاكـردووی ئێـران.

# نرخی سەربەستی

لەو ڕۆژەوە، کە مرۆڤ ئەم سەر زەوییەی کردۆتە نیشتەجێی خۆی هەمیشە لە پێناو ژیاندا لە تێکۆشاندا بووە، بێپشوو لەگەڵ سروشتدا لە بەربەرکانێو شەڕی ژیانو مردندا بووە، ژیری چەکی کاریگەرو هۆی سەرکەوتنیبووە لەم تێکۆشانو جەنگەدا، پاش زاڵبوونو دانیشتنی سەر تەختی سەرکردایەتی ژیانو پەیدابوونی چینەکانی گەل مرۆڤ کەوتە چەوساندنەوەی برای مرۆڤی، چینی چەوساوە پەیدابوو،

بەم جۆرە پیتو فەڕو سامانو ئامێری بەرهەمهێنەر بوو بە ماڵی مفتی چینی چەوسێنەری بە ژمارە کەمو بە سامانو دەسەڵات بە پێوانەی جەورو ستەمو زۆرداری یان فرەو بێسنور، چینە چەوساوەکەش ژمارەی لە سنور بەدەرو لە ساماندا مایە پوچو لە دەسەڵاتیشدا ژێر چەپۆک و پێشیل کراوە، بۆیە تێکۆشانێکی نوێ بۆ پچڕاندنی کۆتو زنجیری بەندایەتی بۆ وەستان ڕوو بە ڕووی چینی کاربەدەستو چەوسێنەر، بۆ سەندنەوەی مافی خوراو وبنیاتنانی کۆمەڵێکی بەختیارو دوور لە چەوساندنەوەو زۆرداریو ستەمو داننان بە مافی ڕەوای چارەنووسی نەتەوایەتیدا هاتە گۆڕێ.

هەموو گەلانی جیهان لەم خەباتە سەختە خوێناوییەدا هاوبەشن، هەرواش بەردەوام دەبێت تاکو داگیرکردنو چەوساندنەوەو ڕژێمی چینایەتی بنەبڕ دەکرێتو لەناو دەبرێت.

نەتەوەی کوردی دلێریش لەم مەیدانەدا شان بەشانی گەلانی جیهان لە سەختترین خەباتدا بووە دژی چەوساندنەوەی نەتەوایەتیو چینایەتیی ئەو هەزاران قوربانییانەی نەتەوەی کوردو گەلانی

جیهان لەم پێناوەدا پێشکەشیان کردووەو دەیکەن (نرخی سەربەستی) یە بۆ گەیشتنیش بەو ئامانجە پیرۆزە زۆر زیاتر لەوەی بەخشراوە ئامادەیە بۆ پێشکەشکردن،

بۆیە ئێستا پاشە ڕۆژی بەختیاریی گەلان زۆر نزیکو ڕوونەو تیشکی سەربەستی لە زۆر لاوە دڕی بە پەڵە هەوری چڵکنی ئەو ئاسمانە داوەو هاکا خۆری (سەربەستی) گەیشتە جەرگەی ئاسمانو تاڵە پیرۆزەکانی تیشکی زێڕینی هەموو کەلێنو قوژبنێکی جیهانی ڕوناککردەوە سەربەستی باڵی ئارامو خۆشگوزەرانیو بەختیاری کێشا بەسەر هەموو گەلانی جیهاندا.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| بێپشوو | : | بێ وەستیان |
| ژیری | : | عاقلیی |
| زاڵبوون | : | ب سەرکەفتن |
| ماڵی مفتی | : | ماڵی خۆڕایی ئانکو بەلاش |
| هاکا | : | هەربینا، هەر ئەوەندە زانی، ژ نشکەکیفە. |
| تاڵە پیرۆزەکانی | : | تیرۆ شکێت پیرۆزێن |
| گەروش | : | |

# ڕەوانـدز

ڕەوانـدز یەکێکـە لـە شـارەکانی هەرێمـی کوردسـتانی عیـراقو کەوتۆتـە باکـوری ڕۆژهەڵاتـی شـاری هەولێـر شـوێنەکەی جێگەیەکـی سـەخت و هەمـوو لایەکـی شـاخو چیایـە، دەورو بەرەکـەی زۆر کوێسـتانەو بـە زسـتانان بەفـر هەمـوو لایەکـی دادەپۆشـێت، ئـەم شـارە هـەر لـە کۆنـەوە جێگەیەکـی دیـار و بەرچـاو بـووە، گەلێـک سـەردەمی مێـژووی بەسـەردا هاتـووە، کاتـی وا هەبـووە زۆر ئـاوەدان بـووە و ڕێبـازی خێڵانـی ئـەو وڵاتـە بـووە، بـەو هۆیـەوە ناوەندێکی بازرگانـی، لـە میوەهاتـدا دەوروبەرەکەی هەمـوو جـۆرە میوەیەکـی هەیـەو لـەم ڕووەوە پێویسـتی بـە شـوێنانی تـر نەبـووە، بـەڵام بـۆ کاروبـاری بازرگانـی تـر، لەگـەڵ وڵاتانـی هەولێـرو موسـڵدا هاتوچـۆی کـردووە، کۆچەرێکـی زۆری بەسـەرەوە بـووەو بازرگانییەکـەی خسـتۆتە بـرەو.

لەسـەردەمی خۆیـدا ئـەم شـارە، حـەوت کاروان سـەرا، دوو گەرمـاو، شـەش مزگـەوتو گەلێـک قوتابخانـەی زانسـتی تێـدا هەبـووە، دەوروبـەری شـارەکە بـە شـورە قایمـکراوە، زیاتـر لـە بیسـت دیوەخانـی میوانداریـی هـی ماڵـە گـەورەی تێـدا بـووە، لەسـەر هەمـوو تەپەیـەک قەڵایـەک هەبـووە، دەروازەی شـارەکە داخـراوە ئیتـر کـەس نەیتوانیـوە بچێتـە ناویـەوە، ئـەم شـارە بـەم جـۆرە بـە ئاوەدانـی هاتـووە، تا کەوتۆتـە سـەردەمی محەمـەد پاشـا (١٧٨٣- ١٨٤٩) لێرەدا ڕەوانـدز پەرەدەیەکـی تـری بەسـەردا هـات، سـنوری وڵات بڵاوبـووەوە، جێگەیەکـی تایبەتیـی لـە مێـژوودا گـرت، کاروبـاری بازرگانـی ئەوەنـدەی تـر پـەرەی سـەند، بەسـتراوە بـە شـارەکانی شنۆو سەردەشـتو لـەم لاوە ئامێدیو زاخـۆو، نـاو شـار لـە بـاری زانیـاریو پیشەسـازییەوە، بـوو بـە بنکەیەکـی تـەواو،

ئاو لەناو شاردا زۆر بوو بۆ بۆ دانیشتوانو بۆ دەغڵودانی دەوروبەر، لە هەموو ئەو دەڤەرانەی سەر بە ڕەواندز بوون قەڵاو قوللە دروستکرا، لەسەر هەر قەڵایەک تۆپێکی گەورە دانرا، لەسەر هەر لولە تۆپێک بە ئایەتی (نصر من الله وفتح قریب) و دیمەنی میری ڕەواندز محەمەد پاشا پیشاندراوە.

لە ڕاستیدا ڕەواندز لە سەردەمی محەمەد پاشادا ناوو دەورێکی تیشکداری هەبووە، لە والی بەغداوە ناسراوە تا پاشای ئەستەمبوڵ لە حاکمی تەورێزەوە ناوی بووە تا شای تارانو ئەسفەهان، لەبەر ئەمە لەنێوان ئەو وڵاتە پانو فراوانەدا دەستە دەستە لە دەزگای سیاسەتو لە ئەربابی عیلمو لە ئاشنایەتی بازرگانی ڕوویان کردۆتە ڕەواندز.

دانیشتوویەکی دڵخۆشی هەبووە، لە مەیدانی زانستدا پایەیەکی بەرزی هەبووە، ڕەوڕەوەی مێژووی ڕۆژەکانی ڕەواندزی پێش سەردەمی محمد پادشای لە سەردەمی ئەودا بە تەواوی گەشاندەوە، گەلێک زانای لێهەڵکەوت، گەلێک میری تێدا پەیدا بوو، وەکوو بڵێیت ئاوو هەوای ڕەواندز لە بارەی سروشتیشەوە هەر گۆڕا!... لەو بەڵگانە، کە لە پاشماوەی ڕەواندزو میری ڕەواندزەوە بەجێماون ئێستاش هەر جێگەی شانازییە بۆ نەتەوەی کورد.

بەم سەیرکردنو خوێندنەوەماندا بۆمان دەرکەوت کە شاری ڕەواندز جێگەیەکی بەرزی هەبووە لەناو لاپەڕەی مێژووی کوردا، هەموو دەمو شایانی ئەوە بووە کە چاوێکی بەڕێزەوە سەیر بکرێت، لە گۆشەی دڵی هەموو کوردێکدا جێگەیەکی تایبەتی هەبێت، چونکە ئەو شارە بە بەردو دارییەوە بە شاخو ئاویەوە لە هەموو دەورێکدا داستان گێڕێک بوو بۆ کوردو شوێنێک بوو کە لە کوردستاندا خاوەنی

مێژوویەکی درەخشان بووە... ئەمەش کە دەوترێت وە نەبێت دەوری ڕەواندز هەر لە سەردەمی محەمەد پاشاوە یا پێش ئەو وەیا هەر لە سەردەمی ئیسلام بوو بێت، بەڵکو ڕەواندز تەنانەت لەسەردەمی پێش ئیسلامیشدا ئەو ناونیشانەی هەر هەبووە!.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| ژوور | : | سەروو |
| خێڵات | : | خێڵەکان، عەشیرەتەکان |
| برەو | : | جوڵاندنو زیاد بوون |
| کاروان سەرا | : | شوێنی حەساندنەوەو گوزەرانی کاروانچیان |
| تەپە | : | گردۆڵکە، بەرزایی |
| درەخشان | : | ڕوناک و پرشنگدار |

## گفتوگۆ:

١. لە نەخشەی هەرێمی کوردستاندا بە تەواوی شاری ڕەواندز دیاری بکەو، دەربارەی شوێنو شاخو داخو ئاوو هەواو هاوینە هەوارو سروشتی خاکەکەیەوە بدوێ؟

٢. لە چ دەورێکدا ڕەواندز، گەیشتبووە پلەی پێشکەوتنو گەشەداری؟

٣. چی دەزانیت دەربارەی حەمە پاشای ڕەواندز بەدرێژی باسیبکە؟

٤. ئایا ڕەواندز هەر لەدەوری ئیسلام و محەمەد پاشادا ناوی بووە، یاخود دەگەڕێتەوە بۆ پێش زایینی؟ هیچ کەلەپوری دەوری بەردی تێدا دۆزراوەتەوە؟

# دارگوێز

ولآتی کوردستان ولآتی پیتو فەڕ، ولآتی کانگای کانزا، ولآتی دارو دەوەن، ولآتی پڕ شاخو داخ، ولآتێکە لە هەموو شتێک کە بۆ ژیانو پێشکەوتنی ژیانو مرۆڤ بەکاربێتو پێویست بێت بێبەش نییە، لە توتنو لۆکەو کەتان تا بەڕوو، مازوو، مێو، هەرمێ، هەنار، گوێز، لە نەوتەوە بگرە تا گۆگردو خوێ، خوا ئەمانەی پێ بەخشیوە، لەناو دارو دەوەنیا دەتوانین بڵێین داری گوێز بە سودترینیانە،

دار گوێز لەزۆر شوێنی کوردستاندا بە تایبەتی لەناوچە کوێستانییەکاندا هەیەو دەڕوێنرێتو پەروەردە دەکرێت، ئەگەرچی ماوەیەکی زۆری دەوێت، تا گەورە دەبێتو پێدەگات، بەڵام کە کەوتە بەر سودێکی زۆری دەبێت چ لەبەرەکەی کە گوێزە چ لە دارەکەی کە دەبڕێتو لەوحەی گەورە گەورەی لێدەتاشرێت، دەتوانین بڵێین باشترین دارە، کە بۆ کاروباری دارتاشیو دروستکردنی کەلوپەلو شتی ناو ماڵ، کە بە نەقشو نیگار دەڕازێتەوە بەکاردەهێنرێت،

گوێزەکەی کە سەوزە هەندێکی لێدەکەنەوە، کە پێیدەڵێن فەریکە گوێزو، ئەوەی تری بەدارەکەوە دەمێنێتەوە تا بە تەواوی پێدەگاتو وشک دەبێت، ئینجا گرددەکرێتەوە وەکو کاڵایەکی بازرگانی دێتە بازاڕەوە دەفرۆشرێت، کاکڵەکەی بۆ بەر چایی وەک خواردنێک دەخورێت، هەروەها لەگەڵ شەکردا دەکرێتە ناو کولیچەو پاقلاوەو گەلێ شتی تر کە بۆ خواردن بەکار دەهێنرێت.

لە کوردستاندا ئەو شوێنانەی، کە بە گوێز بەناوبانگنو گوێزی گەورە گەورەی باشو توێکڵ تەنکو کاکڵ سپییان هەیە، ناوچەی هەورامان لە پارێزگای سلێمانی و باڵەکایەتی و خۆشناوەتی لە هەولێر و کوێستانەکانی دهۆک.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
| --- | --- | --- |
| کان | : | شوێنو جێگای دەرهێنانی ئاسنو مەعدەن |
| کوێستان | : | شوێنە شاخاوییە ساردەکان، زۆزان |
| فەریکە گوێز | : | گوێزی توێکڵە سەوزو نەرم |
| نەقشو نیگار | : | نەخشو وێنە |
| کاڵا | : | کەلوپەلی بازرگانی |
| کاکڵە گوێز | : | ناوکە گوێز |

## گفتوگۆ:

١. گوێز لە چ ناوچەیەکی کوردستاندا هەیە؟

٢. درەختی گوێز سودی چییە؟

٣. ئەو شتانەی کە دارتاش لە داری گوێز دروستیاندەکات چین؟

٤. دار گوێز بە زۆری لە کام شوێنی کوردستاندا هەیە؟

## بـەرزە بـوون

لبـەر دەرگەهـێ خارنگەهـا بەرامبـەر کـەلا دێریـن‌و کەڤنـار دراوەستیاینە، سـەرو چاڤێن وان بێهێزی‌و خـەم ژێ دبـارن... هـەر ئێکی ئێلەگەکی دڕیای دسـەر بێجامێن پاتەکری ڕا یێ لبـەر، پرچێن زەرێن ڤەشـارتین لبن دوو کولاڤێن بەندکا، لێ ئـەو ژی دکەڤن‌و جهێ دروارا لێ دیارە... یێ مـەزن دەرسوکەکا سۆرا دستوییێ خۆ ئالاندی، ژی یێ وی نێزیکی نەهـ سـالانە... هـەر ئێکی سێ چـار جۆتێن گورێن ڕیسی یێ ددسـتادا، هندەک دۆخین یێ لسـەر مـلا... رکو رک بـەرێ وان یێ ل وان مرۆڤێـن دچـن ژوورو دەردکەڤـن... بمەلیلـی دبێژنـێ:

**گورەو دوخینکێن مە بکڕن ئەم بارزانینە:**

لـێ ئـەو کەسـێن ژ خارنگەهـێ دەردکەڤـن، هندەکـێ دەمژویلـن بددانێـن خوڤـەو گۆشـتی بزلکـێ شـخارتێ ژ بـەر دئینـن دەر، سـەرێ وانییێ بلندەو بـەرێ وان یێ ل عەسمانا، هـەر وەکی گوهێن وان دکـەڕو حـەلان... باراپترا ژی بچاڤەکێ پڕ بەزەیی لێ دنێڕن‌و هندەک هیردەی دکەنـە لەپـا...

خولکـێ هـەردوو زاروکا وەک یەکـە، مـرۆڤ دزانیـت براییـن هەڤـن، یـەک سـالەکێ یـان پچـەک پتـر ژ یـێ دن مەزنتـرە... هـەردوو بـۆ دیتنـا بابەکی دخریب‌و مەلیل وتهێنی نـە، هـەردوو ببرینـەکا مـەزن دنالـن.. لـێ نـزا گونەهـا وان چییـە؟ بۆچـی کـو بارزانینـە دڤێت دژوارو برسـی‌و ڕویس‌و خـاس بـن؟! بـێ بـاب‌و خـارن‌و جلکێـن جـوان‌و نـوی بن؟! دبێ گرنژین‌و کەنی بن! ئەگـەر باب گونەهبـارە، چنکی بۆ ڕاسـتیێ خەباتاکری، بـۆ ڤۆناغـا گەهشـتنا چاڤـێ ڕۆژێ یـێ بزڤـی، دارو پویشـێ دهاڤێتینـە سـەر ئاگرێ دۆزێ‌و بێگەشـکری، تڤەنـگا خـۆ یـا درێژ کریـە

گورگێن چاڤ سورو... ما گونەها ڤان بەلاتینکو فریشتێن زارۆک چییە؟!! هێش بو ئەڤینا ڕۆناهییو ڕاستیێ نەلڤینەو نەشەوتینە! هندەک جارا چاڤێن هەردوو بەلەنگازا یێ زیق دبن د جاما خارنگەهێ ڕاتێر ل کەبابو گۆشتو مریشکا دچەرن، تاما وان یا دبتە ئاڤ و قوریچکا دداعیرن... هندەک جارا ژێ یێ شەڕوال یا پانتۆرێ کابرایەکی دگرنو ب خودێو قورئانو پێغەمبەرو چاکا سوندا دخۆن کو بارزانینە، دبێ بابن، نان نینە، دەرهەمەکێ ژێ دخازن.. مروەتو خۆ پەرست بوویە؟!

هەردوو زارۆ ژێ ب چاڤەکێ ترسو بدەستێن لەرزۆک یێ کەسپو کارێ خۆ دکەن.. پارێن نانێ بترسی لێکددەن، نە بخو بتنێ بەلکی بو دایکو هەر چوار خویشکێن هاتینە شوی یا... چەند خەریبییەکا مەزنە، بەرزەبوونەکا پڕ بئێشو ژانو دژوارە، مرۆڤ بابو براو مامو پسمامێن گەنجو پیر نەبینت، هەمی پێکڤە ب ڕۆژەکێ ب گاڤەکێ بێنە گرتنو بەرزەکرن!!

چەند زۆرداریو تاوانەکا مەزنە،مرۆڤ ژ گوندێ خو بێتە دەربەدەرکرن، ژ وارێ خو بێتە دویرکرن، د سەر هندێ ژیرا بەلەنگازو هەژارو خازوک بیتن... ئەڤە چەند ساڵە چوار دیوارێن خانی، ئەو خانیکێ هوڤا بۆ هەڵبژارتی ل چوار خویشکێن ڤان ئێتیمێن باب بەرزە بووینە زیندان، ڕۆناهیو جیهانێ دپەنجەرێ ڕا دبینن، بتنێ دخەونا دا دەردکەڤنە جیهانا بەرفرەهـ و دەس دستوییێ بابو ئەڤیندارا دئاڵینو خەریبیو خەمێن خو دکوژن، پیلێن ئاگرێ هناڤا دڤەمرینن. هەروەکی هەردوو زاڕو زختا ل خودانێ خارنگەهێ ددەن.. گازی کرە شاگردێ خوە:

- قاله وەرە ئەم هەتیوانە بدە بەر زللە، لە چێشتخانە دووریان خەوە.

ڕاستە بابێ وان مروڤەکێ بسۆزو ئەمەک بوو، ژ دلو هناڤا خەباتا کری بۆ دۆزێ، ژ گەنجیا خۆ هەتا سەرو ڕیهـ لێ نیڤ نیڤە سپی بووین، شەڤ و ڕۆژێن کرینە ئێک، هەڤالێن وی، کەسو کارێن وی، برنۆ بوویە... چنکی گوللا برنۆیێ بتنێ بەرسڤا زمانێ هۆڤا ددا... گوللا برنۆیێ بتنێ برینێن وی دەرمان دکرنو دەرگەهێ ئازادیێو تەناهیێو زانینو ڕۆناهیێ دقوتا... چجارا ئەڤینداری برنۆیێ نەبوویە، لێ ببرنۆیێ مانو واری خو دپاراست..

لەو ژبەر وێ سۆزو ئەمەکیێ نهۆ دگەل سێ کوڕێن گەنجو پێنج براو هەمی کەسو کارێن بشێن برنۆیێ هەلگرن، دبێ ناڤ و نیشانن!! ئەگەر دساخ بن دەنگێ وان نالینن.. هیڤیێن وی ژی دیتنا هەردوو خودان بێجامێن دریایو گورە فروشانە، ژبەر خەریبی یا وانو دایکو خویشکێن وان ستێرا دهەژمێرت!!

نوبەداریێو زێرەڤانیێ ل هەیڤێ دگرت... ئەگەر عەسمان ژی لێ نەڤاشارتبت!! هەردوو برایا سەرێن خو پێکڤە نانو دەستێن هەڤ گرتنو قەستا جادا بەر بازاری (هەرەج) کرن... دەمێ جاڤێن وان بزارۆکێن پاقژو بژوین دکەڤن، دەستێن وان دناڤ دەستێن دایبابو براێێن واندا، یان دەمێ زارو کەکی دبینن دناڤ جامێن ترومبێلەکێدا وەکی پاشا پالڤەدای، دلێ وان دکوزرنو گری دبن مارو ل قرکێ دئالێین.

لیڤا جادا بەر بازاری (هەرەج) یا پرە ژ ژ نکێن روی قورمچی، سویسو جلک رەشو مریتوی، ملێن خو وەک سێویو ئێتیمان پێکڤە نانە، لبن دیواری مزگەفتێ، لسەر چیمەنتویا رەقو تەزی، ئەڤ ب

دیواره بتنێ وان ڕەبەنا دحەوینت... لبەر سینگێ هەر ژنکەکێ مێدەکەک یان گوینیکەک یان کەرکار تونەک ڕائیخستیە، هندەک گورەو دوخینو دەسبلینکو کولاڤێنو بەندکا لسەر ڕیز کرینە... ژ وان هێرڤەو لبەر هەردوو لایێن جادێ کەنتورو بەڕکو کەلوپەلێن پێتڤیێن مالێ برێژن... هندەک کەس هەر ڕۆژ یێ ترومبێلا خو دگوهوڕن لدیڤ مودێلو ڕەنگێن جوان... قەسرو کوچکێن خو بلند ترو فرەهتر لێدکەن...

هندەکێ ژی یێ خوها ئەنیا خو دفروشتن، ناڤ مالیا خو دفروشن، دا نانی پێبکرن... هندەکێ بەختێ خو ڕەش دکەن، ڕاستیێ خار دکەن، نامۆیسێ دفرۆشن، دا هەر دقەنەفێن نەرمدا پالدەن، ستێرنا بادەن، چڕوتا بکێشن.. هندەک ژی سپێدا زوی هەتا ئێڤارا درەنگ یێ لسەر ئاخو چیمەنتویا تەزی، لبەر لێڤا جادەو کولانکێن گشتی دڕوینن، دا گورەکێ، کولاڤەکی بفروشن... دا بیرهاتنێن سەربارو فێرسو خوناسێن بەرزەبووین بفروشن، دا ب بهایێ وان نانی بکڕن، سەرێ دێوێ برسی ببڕن.. دا دەڤێ پیسا گرێدەنو سەر بلند ل سبە بنێرن... چەند دوو تەڕازیێن دژ یەکن؟!!.

هەردوو زاڕو بێ دەنگ لبەر تەنشتا ژنکەکا چاڤ کویرو شینا پرچ سپی یا ڕەنگ گەنمی روینشیتن... دەستێ پڕ دلۆڤانی بسەرێ واندا ئینا خار... چاڤێن وانێن وەک عەسمانێ ساهی گەشبوون:
- دادێ ئەم دبرسینە.

دایکێ لێڤا عەبایێ ڕەش بلندکر، سێ نانێن فرنێ یێن تێکوەرپێچای ئینان دەر، هەر ئێکی نانەک دابەر لەقا، هشکو زوها، بێ ناڤ و پێ خارن.

- سەربارێن من نانێ خو بخۆنو هەڕن، لناڤ جادەو کولانکێن باژێری

بگەڕن، دەرگەهێن مالا بقوتن... تشتێن خو بفروشن... ئەڤبازێرە یێ پڕە ژ مرۆڤێن چاکو بڕەحم... بەلێ بەری دنیا تاری بت وەرن، دا پێکڤە بچنە دزیندنا خویشکێن وە تێڤەدا، ئەو زیندانا دێوێ ڕەش بۆمە ئاڤاکری.

١٩٨٦/١٢/١١ هەولێر

ئەڤ چیرۆکە دگوڤارا مەتین ژمارە (٨) خولا سێ یێ گولانا (١٩٩٢)ێ دا لژێر ناڤی (ئێتیمێد باب بەرزە ) بەلاڤ بوویە.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
| --- | --- | --- |
| بەرزە بوون | : | بزربوون، ون بوون |
| خارنگەهـ | : | خواردنگە، چێشتخانە |
| کەلا دێرین | : | قەڵاتی دێرین |
| ئێلەکەکی دڕیای | : | یەلەگەکی دڕاو |
| کولاڤێن بەندکا | : | کڵاوی بەن |
| دکەڤتن | : | کەوتن، کۆتن |
| بمەلیلی | : | بە مەلوولی، عادزی |
| یزلکێ شخارتێ | : | بە دارۆچکەی شخارتە |
| بارا پترا | : | زۆربەی، بەشی زۆری |
| هیردەی دکەنە لەپا | : | ورردەیان دەخەنە ناو دەست |
| تێهنێ نە | : | تینوون، تینینە. |
| ژارو برسیو رویسو خاس بن | : | هەژارو برسیو ڕووتو پێ خواست بن |
| ریێ گرنژینو کەنی بن | : | بێ گرژینەوەو پێکەنین بن |
| بەلاتینک | : | پەپولە |
| دچەرن | : | دنۆڕن، دەنۆڕن |
| هۆڤێ پرسێ | : | هۆکاری برسیەتی. |
| دزکی واندا | : | لەسکی ئەوان دا |
| ب چاڤەکێ پڕ کرێتوکەربڤە | : | بە چاوێکی پڕ لە ناشیرینیو ڕقوکینەوە |
| خازوک | : | دەرۆزەکەر |
| خوها ئەنیا خو | : | ئارەقی هەنیەی خۆیان ئارەقی نیو چاوانیان |

## گورگو ئێستر

دەڵێن جارێک گورگ وتی: تۆبە دەکەمو ئیتر بەسەر ئەم درندەییو ئازار گەیاندنە بە خەڵک، با ڕێگەی حەج بگرمە بەرو پاش حەجەکە لە گۆشەیەک بۆ خۆم دانیشم خەریکی خوا پەرستی بم تا خوا ئەم ئەمانەتەم لێ وەردەگرێتەوە!

لێیدا وردە وردە بەڕێکەوت ڕۆیشت برسێتی ڕۆژ بە ڕۆژ بێ هێزتری دەکرد، وای لێهات لاکەی دەهات لە برسان. ڕۆژێک لە دوورەوە ئێسترێکی لاتی بەرچاو کەوت، کە بەرەڵاکرابوو گوتی: خودا لە وەختی تەنگو چەڵەمەدا حەرامی حەڵاڵکردووە، من ئەوەتا لە برسانا دەمرم، با تۆبەشم کردبێتو بۆ حەجیش بچم، بۆم حەڵاڵە بچم ئەو ئێسترە بخۆم، چونکە ئەگەر نەیخۆم دەمرمو پەکی پەرستشو خواناسییەکەم دەکەوێت!

چوو بەلای ئێسترەکەوەو مرخی خۆی لێخۆشکرد، ئێستر پێی گوت: مام گورگ ئەوە ئۆغربێت وا لەم دەشتەدا وردە وردە دەڕۆیتو هاتویت بەلای منەوە؟! وتی ئۆغرمان خێربێت، دەمەوێت بچم بۆ حەج بەڵام زۆرم برسی بوو، بە شەرع بۆم حەڵاڵە تۆ بخۆم، هاتووم بتخۆمو پاشان بڕۆم!

ئێستر وتی: یاخوا بەخێربێت خودا حەجت قبوڵ بکات، بەڕاستی منیش لەم ژیانە وەرزبوومو دەمەوێت ڕزگارم ببێت، بەڵام مام گورگ تۆ خۆت دەزانیت گەلێک حەدیسو ئایەت لەسەر ئەوە هەیە، کە ئەگەر گیاندارێک سەربڕا دەبێت بە جۆرێک سەر ببڕێت، کە زوو گیانی دەرچێت، ئێستە منیش وەختی خۆی کە ناڵکراوم بزمارێک لە وەختی ناڵەکەدا چووە بە گۆشتەکەمدا زۆر ئازارم دەدات، تۆ لەولاوە

بمخۆیتو ئەمیش لەم لاوە ئازارم بدات ئەمە پێچەوانەی ئەو خوا ناسییەیە، کە تۆ گرتووەتە بەر، ئەگەر بە زەحمەتی نازانیت لە پێشدا ئەو بزمارە دەربینیتو پاشان بە شێنەیی بمخۆیت خێرت دەگات!

مام گورگ وتی: ڕاست دەکەیت، کامەیە تا بۆت دەربینم!

ئیستر قاچی بەرزکردەوەو پیشانیدا، مام گورگ بە وەستایی لمۆزی بۆ درێژکرد کە دەریبینێت، لەو کاتەدا ئێسترەکە لەقەیەکی مالی بە دەمو لمۆزی گورگەکەدا و هەموو ددانەکانی خستنە خوارەوەو لەوێ بەبێ هۆشی بۆ خۆی کەوتو ئیسترەکەش لێیدا ڕۆیشت!

پاشان کە هاتەوە هۆش خۆیو سەیری حالو بالی خۆیکرد، ڕوویکردە خۆیو بەخۆی وت: (ئاخر خودا بتگریت گورگ! تۆ باوکت نالبەند بوو، باپیرت نالبەند بوو) تۆ لە کوێو نالبەندی لەکوێ؟ دەبیخۆ ئەوە دەردت بێت!

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| لاکەی دەهات لە برسانە | : | نەشیا بوەستیت ژ برسا |
| پەکم دەکەوێت | : | مەحتەل دەبم |
| وەستایی | : | شارەزایی |
| قاچ | : | پێ |
| لمۆز | : | دەڤ |
| شینەیی | : | لەسەرخۆ |
| سەرگوزشتە | : | بەسەرهات |
| مرخی لێخۆشکرد | : | ددانی بۆ تیژ کرد |
| لات | : | لەڕ، لاواز |
| لەقە | : | پەحین |
| ئازار | : | ئیش |

## گفتوگۆ:

١. چ پەندێک لەم سەر گوزەشتەیە وەردەگرین؟

٢. ئایا گورگ توانی دڵو دەروونە شەرانییەکەی خۆی بگۆڕێت؟

٣. ئێستر بۆچی بەخێرهاتنی گورگی کرد؟

٤. ئایا پێت خۆشە کە گورگەکە دەمو لمۆزی شکاو ددانەکانی کەوتنە خوارەوە؟!

٥. ئایا دەتوانیت سەر گوزشتەیەکمان بۆ بگێڕیتەوە پەندێکی تێدا بیت؟

٦. ناوەڕۆکی ئەم سەرگوزەشتەیە بکە بە وتارێکی کورت، واتە بەشێوەی چیرۆک نەبیت؟

# سەرهەڵدان

چەند زڤستانەکا ساردو سڕ ب سەر کوردستانێدا دهات، بەفرا گران رێو بان دگرتن، سینگێ کوردان هند. تەنگ بیتو دلێن وان، بێهنا وان کورت بیت، بەلێ... کوردێ رەبەن دلێ خۆ ب هندێ خۆش دکر کو دێ بهارەکا گەرمو تەڕ... پڕ گولو کولیلک.. پڕ بێهنو گوڵاڤ و پەلاتینک هێتو دێ پشتێ خۆ دانیتو بێهنا خۆ ڤەکەتو تالێو سویرییێن ژیانێ ژ بیرکەت. دا بیتە بهار، بەلێ نە ئەو بهار ئەوا وی دڤیاو خەون پێڤە ددیتن، بهارەکا بەهی، یا هشک، یا قەحیایو بۆشی، خەمێن دلێ وی پترو گرانتر لێدکرن، ژبەر کو دەستو پێن وی دگرێدایو چاڤ و دەڤێن وی دپێچایو گوهێن وی دنژنی بوون.

تا سالا ١٩٩١، تراریێ رکا کوردان تژیبوو، ل زڤستانێ بسەردا چوو... ڤێدا رشت، دەنگێ کاوەی بەری نەورۆزێ بلند بوو، ئاگرێ تۆلان هەلبوو، گڕدا هەمی لەشەکی، گەرمایدا هەمی دلەکی، دەربەندا سەر هەڵدانێ ل (٥) ئاداری ل (رانیە) دەرۆکێ خۆ شکاندو دلێر یا پێشمەرگێ کوردو دلسۆزیا گەلێ کوردستانی تێکەلێک بوونو وەک سویلاڤێن ئاگری ب چیاو گەلیو گرو دەشتو باژێرو گوندانداا هاتنە خارێ.

دەنگێ تڤەنگێن ئازادیێ، فیشەکێن سەربەستیێ چەرخو فەلەک ڤەگرتن، نڕینا خورتو گەنجێن کورد هەمی جهەک ڕاهژاند... دگەل هندێ دلێن دوژمنان ڕاوەستان... هشێن وان ڕاوەستان، یێ نەهاتیە کوشتنو پێسترکێ نەگرتی رەڤی، ئادارا پیرۆز ل هەولێرێو نەورۆزا شکۆدار ل کەرکوکێ بهارا خۆرستا کوردان ساخکرەڤە، سەر هەڵدانێ شەڤا تارو دریژا فاشستان ل کوردستانێ ڤەرە ڤاندو رۆژا گەشا

ئـازادیو سەربەسـتیێ ل گوپتیکێـن چیاییـن کوردسـتانێ دەرکەڤتەڤـە گـرییو هەواریـن زارۆکان، بوونـە سـترانو سـرودێن نیشـتمانی، بـژی کـوردو بـژی کوردسـتان.

## واتـای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| بێهنا خۆ ڤەکەت | : | بحەسێتەوە |
| ترار | : | هیمارو قاپو قاچاخ |
| تراریێ رکا کوردان | : | هیماری رکو کینەی کوردان |
| تژی بوو | : | پڕ بوو |
| شرینا | : | نەریتی |
| ڤەرەڤاند | : | رەواندەوە |
| گۆ پتیکێت چیایین | : | لوتکەی چیایان |
| دەرکەڤتەڤە | : | دەرکەوتەوە |
| پشتییێ خۆ دانت | : | کۆڵەکەی دادەنێت، ئەوەی لەپشتێتی دای دەنێت |
| ڤێدا رشت | : | پێیدا رژا |
| نڕینا خورتو گەنجێن کورد | : | نەڕاندنی خورتو لاوی کورد |
| گرییو هەوارێن زارۆکان | : | گریانو هاواری منداڵان |

## هونەری شانۆگەری پێویستی بە هەرەوەزە

ئەگەر داوا لە وێنەکێشێک بکەین بەدەستو پەنجە ڕەنگینەکانی وێنەیەکمان بۆ بکێشێت، سەیردەکەین دادەنیشێتو قەڵەمو فڵچەو بۆیەی ڕەنگاوڕەنگ لە خۆی کۆدەکاتەوەو دەستدەکات بە وێنەکێشان، بەڵام لەو هونەرەدا کە لەسەر شانۆ پیشاندەدرێت تەنیا یەک کەس هەموو کارەکان ناکات، بگرە گەلێک هونەرمەند وەک: وێنەگرو ڕێپیشاندەرو ئیکسسوارستو ئەندازیاری دیمەنو مۆسیقا هەڵبژێرو کارەبایی‌و ئاکتەرو نووسەر، هەرەوەزی لێدەکەن ئینجا هونەرێکی سەر شانۆ پێشکەشدەکەن، کەواتە ئەم هونەرە سەربەخۆ نییەو تێکەڵە لە چەند هونەرێکی تر، بەڵام ئەوەی کە زۆر پێویستە بۆ سەرکەوتنی ئەم هونەرە، چیرۆکی باشو نایابە.

ئەوەی چیرۆک بۆ شانۆ دەنووسێت دەبێت هونەری شانۆ چووبێتە ناو دڵو خوێنو موخییەوە، ئەو وشانەی دەیاننوسیت دەبێت تەواو قسەی ئەوانە بێت، کە بە ناویانەوە قسەدەکات... بۆ نمونە ئەگەر لەسەر زمانی جوتیاری ناوچەیەکی وڵاتی خۆمان قسەیکرد دەبێت ڕادەی تێگەیشتنو جۆری گوزەرانو بیرکردنەوەی ئەو جوتیارە لەو ناوچەیەدا بزانێتو شتێک نەنووسێتو نەڵێت، کە لە قسەی ئەو نەچێت.

ئەمە لە لایەک لەلایەکی تریشەوە دەبێت ئەو نووسەرە بە تەواوی شارەزای دڵو دەروونو حەزو ئارەزووی ئەو خەڵکە بێت، کە چیرۆکەکە دەخوێننەوە یا لەسەر شانۆ دەبینن، ئەمە جگە لەوەی کە هەر ئەو نووسەرە دەبێت بیرو باوەڕێکو خەیاڵێکی فراوانی ببێتو دنیای زۆر دیبێتو شتی زۆر تاقیکردبێتەوەو قوڵ بڕوانێتە

ژیان، ئەگەر وابوو ئەوە بە ئاسانی دەتوانێت خەڵکێکی زۆر لە دەوری چیرۆکەکەی گردبکاتەوە، بەڵام ئەگەر وا نەبوو و هەر ڕۆژەو لەسەر پەتێک یاریکرد، ئەوا خەڵکی ڕوو لە چیرۆکەکەی وەردەگێڕن، چونکە بە لای ئەو خەڵکەوە نووسەر ڕابەرە، نەک بێبارو بێبیرو باوەڕ، خەڵکی دەیانەوێت نووسەر بیان جوڵێنێتو تەزوو بە لەشیاندا بهێنێت، نەک ساردیان بکاتەوەو خوێن لە لەشیاندا بمەیەنێت، خەڵکی دەیانەوێت نووسەر ئازاو نەبەزو چاو نەترس بێت نەک ترسنۆکو چاو شۆڕ بێت بە فویەک گیانی دەربچێت، دەیانەوێت نووسەر پێش ئەوەی چرا لە مێشکی ئەماندا هەڵبگیرسێنێت بۆ ئەوەی ڕێگەی ئامانجیان بۆ ڕوناکبکاتەوە، مێشکی خۆی ڕوناککردبێتەوە، ڕێگەی خۆی دەستنیشانیکردبێت.

لە چیرۆک بۆ شانۆ نووسیندا، گرنگ ئەوە نییە کە لە باسێکی گرنگو بە بایەخ بنووسین، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، کە باسەکە لەسەر بیرو باوەڕێکی بنەڕەتی وا دامەزرابێت، کە پەلوپۆی بە هەموو لایەکی چیرۆکەکەدا هاویشت بێتو گیانی بکات بەبەردا، چونکە بەبێ بیرو باوەڕێکی بنەڕەتی وا چیرۆکەکە بێگیان دەبێتو مردار دەبێتەوە.

دیسان ئەگەر بیروباوەڕە بنەڕەتییەکە هیچ و پوچو لاوازو ئاڵۆز بوو، ئەوا چیرۆکەکە سەرتاپای دەڕوخێت. ئەوەشمان نابێت لەبیر بچێت، کە بیروباوەڕە بنەڕەتییەکە دەبێت ڕوونو دیاربێتو شاراوە نەبێت ئەگینا هەرەس دەهێنێتو پەرشو بڵاودەبێتەوە، چونکە هەوێنی چیرۆکەکە بیروباوەڕە بنەڕەتییەکەیە.

دوای دەستنیشانکردنی بیروباوەڕە بنەڕەتییەکە ئینجا نۆرەی پلاندانان یان ڕەنگڕشتن بۆ دروستکردنی چیرۆکەکە دێت، هونەرمەندی

وا هەیە ڕەنگێکی تۆخ بۆ چیرۆکەکەی دەڕێژێت، هەندێکی تر هەروا لە مێشکی خۆیاندا دایدەڕێژنو ئینجا لە کاتی نووسیندا درێژەی پێدەدەن، هونەرمەندیش هەیە پێشەکی هیچ پلانێک دانانێتو لەکاتی نووسیندا دایدەنێت بەڵام ئەمەی دواییان چیرۆکەکە تێکدەداتو لاوازیدەکات ئەم پلانو ڕەنگرشتنو دارشتنە پێیدەڵێن (سیناریۆ) دیارە زۆر جار ئەم وشەیەت لە کتێب، یان سینەما، یان تەلەفزیۆندا خوێندۆتەوەو دیوە، دوای ئەمە دەستدەکرێت بە نووسینو نووسینیش هەروا شتێکی ئاسان نییە، لە پێشەوە باسمانکرد کە دەبێت نووسەر چۆن بێت، بۆیە ئەگەر ئەو مەرجانەی تێدا نەبوو نووسینەکەی دەڕمێتو خۆی ناگرێت.

ئەوەی چیرۆک بۆ شانۆ دەنووسێت دەبێت ڕووداوەکان لە ژیاندا چۆن ڕوودەدەن ئاوەها بیانووسێت، بۆ نمونە ئەگەر باسی ئەوەیکرد کە ژنو مێردێک لە یەکجودابوونەوە، نابێت یەکسەر بە دوو وشە بیڵێتو بیبڕێتەوە چونکە لە ژیاندا وا نییە بەڵکو لەپێشدا ناخۆشییەک ڕوودەدات، ئینجا تورە بوونێک ئینجا دڵشکستییەک ئازارێک ئینجا دڵتەنگیو پێکەوە گوزەران نەکردن ئینجا لە یەکجودابوونەوە.

شتێکی گرنگی تریش لە چیرۆک بۆ شانۆ نووسیندا هەیە، ئەویش جۆری گفتوگۆی ئەو کەسانەیە، کە پاڵەوانانو بەشدارانی چیرۆکەکەن، چونکە تا جۆری گفتوگۆ گەرمو گوڕترو بە سۆزتر بێت چیرۆکەکە سەرکەوتووتر دەبێت ئەگەر گفتوگۆکە خاوو بێهێز بوو چیرۆکەکە بە هیچ دەردەچێت.

ئەمانەی باسکراون بنچینەو ناوەڕۆکن لە نووسینی چیرۆکی شانۆیی بەمانەدا تێدەگەیت کە هونەر شانۆگەری هونەرێکی تێکەڵەو

تەنیا یەک هونەر نییە، ئەوانەی خەریکی ئەم هونەرەن دەبێت هەر لە خۆیانەوە شانۆیان خۆش بوێتو شارەزاییان لەو هونەرانەدا ببێت، کە پەیوەندیان بە شانۆوە هەیە، جگە لەمانەش دەبێت بەهرەدارو دنیادیدە بنو تەشی ژیان بایدابنو بە تەواوی هەست بەوە بکەن لە چ دەورێکدا دەژین ئەو دەورە پێوەستی بە چییەوە چ ئامانجێکی هەیە.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| هەرەوەز | : | زبارە |
| وێنەکێش | : | ڕەسمکێش، ڕەسام. |
| گوزەران | : | بژێوی |
| بێبار | : | دووڕوو |
| پلان | : | نەخشە |
| بە بایەخ | : | گرینگ |
| هەرەس | : | ئاشوت، ڕمین |
| پەرش بلاو | : | بلاڤ |
| دەرمێت | : | دێ هەرفت |
| ڕمان | : | هەرفین |
| بێ پێز | : | بێ هێز |
| گفتوگۆ | : | ئاخافتن |
| ئەندازیاری دیمەن | : | موهەندیسی دیمەن |
| ئاکتەر | : | مومەسیل |

## گفتوگۆ:

١. ناوی ئەوانەی بەشداری هەرەوەزی شانۆگەری دەبن بنووسە؟

٢. دەبێت نووسەری چیرۆکی شانۆیی چ جۆرە سیفاتێکی تێدا بێت؟ دەبێت چیرۆکەکە چۆن بێت؟

٣. ئەو مەرجانەی لە هونەری شانۆگەریدا هەیە چین؟

٤. ئایا لە کوردەواریدا هیچ نمونەی چیرۆکی شانۆگەری هەیە، ناوی هەندێک لەو چیرۆکانەو ناوی نوسەرەکانیان بڵێ؟

# نامیق کەمال

ئـەم شـاعیرە نیشـتمانپەروەر و بەناوبانگـەی تـورک، لـە مانگـی کانونـی یەکەمـی سـاڵی (١٨٤٠)دا لـە شـاری (تیکـرداخ) لەدایکبـووە، خێزانەکەیـان نـە زۆر دەوڵەمەنـدو نـە زۆر هـەژار بـوو، باپیری لەم شـارەدا فەرمانبەرێکی میری بوو، کە نامیق کەمال بوو بە هەشت ساڵان دایکی کۆچی دواییکرد، ئیتر کەوتە لای باپیری، چونکە (مستەفا عاسم بەگ)ی باوکی لە (ئەستەمبۆڵ )ی پایتەخت وێڵی ئیش‌و کار دۆزینەوە بوو.

کـە بـوو بـە دە سـاڵان، باپیـری هێنـای بـۆ پایتەخـت‌و لـەوێ جێنشـین بـوون‌و چـوو بۆ قوتابخانـەی (ڕوشـدیە)وە، لـەو قوتابخانەیـەدا زیرەکی‌و زرنگی نامیق دەرکـەوت، بەتایبەتـی توانایەکی یەکجار مەزنی هەبـوو لـە هۆنـراوە لەبەرکردنـدا، زۆر خـووی دابـووە خوێندنـەوە، بـە زۆری نووسـراوی ئەدەبـی دەخوێنـدەوە.

لەگـەڵ باپیریـدا چۆتـە گەلێـک شـوێن وەک (فـارس)و (سـۆفیا)، بـە تایبەتـی لـە سـۆفیا هەمـوو کاتـی بێئیشـی بـە خوێندنـەوە دەبـردە سـەر، لـەم تەمەنـەدا بـوو، کـە نزیکـەی بیسـت هـەزار دێـری هۆنـراوەی لەبـەر بـوو، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە فێـری زمانـی بولغـاری‌و فارسـی‌و عەرەبیش بوو، لە ساڵی (١٨٥٧)دا گەڕانـەوە بۆ ئەسـتەمبوڵ، ئەوەنـدەی پێنەچوو باپیری کۆچی دواییکردو ئیتر هاتـەوە لای باوکی، کە هەندێ دەسـترۆیوو بـوو، بـە دڵـی نامیـق پـارەی تێـدا خـەرج دەکـردو درێغـی لێنەدەکـرد، دوای ماوەیـەک لـە دەزگای تایبەتـی سـەر بـە وەزارەتـی دەرەوەی دەوڵەتـی عوسـمانیدا بـوو بـە (وەرگێـڕ).

لـەم تەمەنـەدا پەیوەنـدی لەگـەڵ شـاعیرەکانی هاوچەرخـی خـۆی پەیداکـردو زۆرجـار لـە گەڵیانـدا دادەنیشـت‌و سـودی لێوەردەگرتـن،

بەتایبەتی لەگەڵ ئیبراهیم شناسی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (تەسویری ئەفکار)دا زۆر تێکەڵبوون، ئەوەندەی پێنەچوو ئەم شاعیرە هەڵکەوتووە فێری زمانی فەرنسیش بوو، دەستیکرد بە خوێندنەوە ئەدەبی فەرەنسی، دەرگای ئەدەبو شارستانێتی ئەوروپای بۆ کرایەوە، زۆر شت کە لەوەوبەر پەی پێنەدەبرد، شارەزا بوو، ئەم شارەزاییە کاری تێکردو ئەم کارتێکردنەش بەسەر بەرهەمەکانییەوە دیار بوو.

نامیق کەمال زۆر خەفەتی بەو دەخوارد، کە میللەتە دواکەوتووەکەی بە دەست سوڵتانێکی زۆردارەوە دەناڵێنێتو زۆر نەبەزو چاونەترس بوو، حەزی لە خۆهەڵکێشان نەدەکرد، جگە لە خزمەتکردنی بیروباوەڕە نوێیەکەی خۆی هیچ شتێکی بیر نەبوو، چونکە بڕوای وابوو کە بە بڵاوبوونەوەی شەو بیروباوەڕە میللەت ڕزگاری دەبێت، ئەم شاعیرە لەناو شاعیرو دۆستو برادەرەکانیدا بە (فیدائی کەمال ) ناوی دەرکردبوو، کە ئیبراهیم شناسی مامۆستای بۆ ماوەیەک چوو بۆ ئەوروپا جگە لە نامیق کەمال بە کەسی تردا ڕانەپەرموو، کە بیخاتە شوێنەکەی خۆی، ئا بەم شێوەیە ئەم شاعیرە نەبەزە لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا بوو بە سەرنووسەری بەناوبانگترین ڕۆژنامەی ئەدەبیو کۆمەڵایەتیی ئەو ڕۆژە لە ئەستەمبوڵدا.

ئەو نووسینانەی نامیق کەمال دەینووسی بە دڵی میری نەبوو، لەبەر ئەوە ویستیان دووری بخەنەوەو بینێرن بۆ (ئەرز ڕوم)، کە نامیق بەمەی زانی چوو بۆ ئەوروپاو لە فەرەنسا سێ ساڵ مایەوەو خەریکی خوێندنو خوێندنەوە بوو، لەگەڵ شۆڕشگێڕە دوورخراوە عوسمانییەکاندا، کە لە فەرەنسا بوون پەیوەندی پەیداکرد، ئینجا چوو بۆ

لەندەن‌و لەوێ لەگەڵ برادەرێکی ڕۆژنامەیەکیان بە ناوی (حوریەت)ەوە بڵاوکردەوەو لە ساڵی (١٨٧٠)دا گەڕایەوە بۆ ئەستەمبوڵ‌و دەستیکرد بە نووسین. دیسان میری لێی ترسا. نامیق کەمال زۆر بڕوای بەوە هەبوو کە (شانۆ قوتابخانەی گەلە)، بۆیە دەستیکرد بە نووسینی شانۆگەری‌و چیرۆکی (وەتەن یا سیلیستر) کە چیرۆکێکی شانۆییە، لەو کاتەدا داینا لە ساڵی (١٨٧٣)دا بوو، کە بۆ (ماگۆسە)ی قوبرس دووریان خستەوە، لەوێ سی‌و هەشت مانگی ڕەبەق لە زینداندا مایەوەو هەر لەوێشەوە گەلێک لە شاکارەکانی نووسی.

کە پاشا لە تەخت داگیرا، ئەمیش لەگەڵ دوورخراوە نیشتمانپەروەرەکانی تردا گەڕایەوە، دیسان دەستیکردەوە بە چالاکی نواندن، بۆیە جارێکی تریش دوور خرایەوە بۆ دورگەی (میدیلی)، ئینجا نێررا بۆ (ڕۆدۆس)، لەوێشەوە بۆ دوورگەی (ساکز) کە پێش ئەوەی بنێررێت بۆ ئێرە نەخۆش بوو، وردە وردە نەخۆشییەکەی زیادیکرد، تا لە (دوو)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٨٨٢)دا کۆچی دواییکردو لەسەر ڕاسپاردەی خۆی لە (بۆلایر) نێژرا. بەڵێ شاعیرێک کۆچی دواییکرد کە هەمیشە بۆ میللەت دڵی لێیدەدا، کە نەیدەزانی بەزین‌و ترس چییە!

## نمونەیەک لە هۆنراوەکەی

**ئای سەربەستی چەند ڕازاوەیت**
**کاتێک وەک خۆر هەڵدێیت لە دەم ئاسۆوە**
**تا دەتوانی دڵمان خۆش کە، بەخیل مەبە بەرامبەرمان**
**لەبەرچاومان بزر مەبە، خۆتمان لێمە شارەوە**
**ئەی سەربەستی، هیوای دوا ڕۆژ، خۆشەویستی گیانو دڵ**
**تۆ کە دنیا ڕزگار دەکەیت لە دیلێتیو ترسو سڵ**
**ئەی سەربەستی تۆ بەدەستی، دەسەڵاتت بە جیهاندا بڵاو بکە**
**ڕاپەڕە ئەی شێری بریندار سەربەستی**
**وا سەگەلی زۆرداری لە دەریای زوڵمو زۆردا مەلە دەکەن!**

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| هاوچەرخ | : | عەسری، هاوزەمان |
| پەی بێ نەدەبرد | : | نەیدەزانی، نەدزانی |
| بەرهەم | : | بەرهەڤ |
| پێداراپەڕموون | : | تێڕادیتن |
| ڕەبەق | : | تەواو |
| سەگەل | : | سەگ گەل، کۆمەسەگ |
| نەژاد | : | ئەسڵ، بنەچە |

## گفتوگۆ:

١. چۆن نامیق کەمال بوو بە خاوەنی بیروباوەڕێکی نوێ؟

٢. ئەو سەردەمەی کە نامیق کەمال زمانی بولغاریو فەرەنسی فێربوو هۆنراوەی تورکی لەسەر چ شێوەیەک ڕێکدەخرا؟

٣. ئایا فێربوونی عەرەبیو فارسی بۆ تێگەیشتنی هۆنراوەی تورکی ئەوسا پێویست بوو؟ بۆچی؟

٤. چۆن دەتوانیت بیسەلمێنێت، کە نامیق کەمال نیشتمانپەروەرێکی نەبەرد بووە؟

٥. لێچواندنی سەربەستی بە شێری بریندارو زۆرداری بە سەگەلات چۆنە؟

٦. مەبەستی ئەم دێرە شیبکەرەوە:

ئەی سەربەستی، هیوای دوا ڕۆژ، خۆشەویستی گیانو دڵ

تۆی کە دنیا ڕزگار دەکەیت لە دیلێتیو ترسو سڵ

٧. ئەم هۆنراوەیە بکە پەخشان بە مەرجێک حەوت دێڕ کەمتر نەبێت:

ئای سەربەستی چەند ڕازاوەیت

کاتێک وەک خۆر هەڵدێیت لەدەم ئاسۆوە

لە دیلێتی ئازاد دەبین دەکەینە دوای عەشقی تۆوە.

٨. ئەم وشانە بخە ڕستەوە بە مەرجێک لەو ڕستانەی ناو ئەم باسە نەبن: (سڵ، ئاسۆ، سەربەستی، دیل).

# هەژاری

ئەگەر بۆ شتێک دژو دوژمنی خۆی بۆ دیاریبکەین، هەروەک چۆن سەری (سارد)و (گەرم)ی تەوژمی کارەبا بەرامبەر بە یەکو دژی یەکو لەگەڵ یەکدا نەگونجاون، هەروەها دەبێت بە پێی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر کە دەڵێت:

(هێندەی نەماوە هەژاری ببێت بەبێ باوەڕی)، موسڵمانیو هەژاری بکەین بە دوو دیاردەی لەگەڵ یەکدا نەگونجاوو یەک نەگرتوو. پێغەمبەری مەزن جارێکی تر دەفەرمووێت: (ئەگەر هەژاری تاکە پیاوێک بووایە دەمکوشت)، واتە ئەگەر هەژاری کەسێک یان گیانلەبەرێک یان بوویەکی هەست پێکراو بووایە دەمکوشتو ئەوە ئیسلام تاکە ڕێگە بوو بۆ ڕزگارکردنی هەژاران.

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودانەو وتەی پەیڕەوی هەموو ئەو ئایینو باوەڕانە بکەین، کە بەدرێژایی هەزاران ساڵی بوونی ئادەمیزاد لە دەمی پیاوی مەزنو ژیرو ڕابەرانو خێرخواهان بیستراوە، یا ئەگەر تەماشای زۆر لەو ڕێگەو پەیڕەوانە بکەن، کە ئادەمیزاد لە ڕۆژو ساڵو سەدەیەکی مێژوودا کردوویەتی بە ڕێبازی خۆی، ئەوا بە ئاشکرا دیمەنی دوژمنی هەژاریو نەویستی و نەبوونیو خۆزگەی بەختیاربوونو تێرو تەسەلبوون دەبینین.

برسێتی دوژمنی توخمی مرۆڤەو تێری دۆستیەتی ئەوە، ڕووتو ڕەجاڵی دەستکردی بەرەی بەدخواهـ و تاریکییەو پۆشتەیی خوازی سیفەتی بەرزی مرۆڤ خواهـ و چاکە پەرستانە، هەموو کەس

تێربێت، هەموو کەس پۆشتە بێت، ئاواتی کۆنی ئادەمیزادەو لەگەڵ بوونی سەرزەویدا پەیدابووە، ئەم ئاواتە مەردانەیە لای زۆر پیاوی ژیرو فەیلەسوفو پیاوچاک زۆر بە ساکاریو دڵپاکی وتراوە، زۆر ئاوات لە دڵدابوون بە مەلو باڵدارو داوێتی لە شەقەی باڵو خەیاڵ بەرەو کۆمەڵێک، کە هەژاریو نەبوونی تێدا نەبێت، بەرەو کۆمەڵێکو خاکێک ناڵەی هەژاران مەرگی جوانان ناوی لەوێدا نەبیسترێت، بەلام کوا ئەو خەوە خۆشە؟ کوا ئەو کۆمەڵو وڵاتە بێخەوشە؟ چۆن هەژاریو برسێتیو نەبوونی نامێنێت؟ چۆن کۆمەڵی ئادەمیزاد وای لێدێت، کە (کاسەی پڕ ئاشتی ماڵ بێت)، ئەو ئادەمیزادانەی کە کەسیان ئەوی تریان ناچەوسێنێتەوە، وەک برا بژین.

ئەو دەمە ئادەمیزاد برا دەبن کە کاسە پڕ بێتو ئەو کاسە پڕە بۆ هەمووان بێتو کەس بەشی کەس نەخواتو کەس ڕێگەی قامچیو کۆتو زنجیرو فڕوفێڵ نەکات بە ڕێگەی بۆ بەشی برا خواردنو بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی ترو بەری ڕەنج خواردنیان. هەزاران فەیلەسوفو دانا بە حەسرەتی ئەو کۆمەڵە بەختیارەوە سەریان نایەوەو هەوڵو کۆششیان بۆ ئەوە بوو، کە ڕێو شوێن بۆ پێکهێنانی ئەو کۆمەڵە بەختیارە دابنێن. چۆن هەژاری نەهێڵن؟ چۆن زوڵمو زۆر لەناو بەرن؟ چۆن کاسە پڕ بکەنو ئاشتی بخەنە ماڵەوە، وڵاتەوە، جیهانەوەو خەڵکو مرۆڤ بکەن بە برا؟

زۆر خەیاڵی جوان جوانیان دەڕازانەوە، زۆر بیری سەیریان بۆ دەهات، زۆر لە زاڵمان دەپاڕانەوە، کە دەست لە زوڵملێکراوان هەڵگرنو قامچی فڕێدەن، زنجیر بشکێننو خوێن نەمژن.

بەڵام ئەم خەوو ئاواتو داخوازانە، هەر چەندە شتی مەردانەو پڕ سۆز بوون، بەڵام ڕێگەی ڕاستەقینەی لەناوبردنی هەژارانو چەوساندنەوە نەبوون، زانستی تازە هەر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ئەو ڕێگەیەی بە ئاشکرا دەستنیشان کرد.

بۆ ئەوەی زۆردار زۆرداری نەکات، ڕەنجخۆر ڕەنج نەخواتو خوێن نەمژێت، ئەو چەکو هۆیەی لێبسێنێتەوە، کە بەسەر زۆربەی زەحمەتکێشاندا زاڵیکردووە، ئەویش هۆیەکانی بەرهەمهێنانە، هۆی بەرهەمهێنان لە گاسنەوە بۆ تراکتۆر، لە مەکینەوە بۆ کارگەی گەورە، دەبێت موڵکی هەموو خەڵک بێت، موڵکی ئەوانە بێت، کە ئیشی پێدەکەنو بەرهەمی پێدروست دەکەن، زەوی بۆ کەسێک کە دەیکێڵێت، کارگە بۆ هەموو کارکەران، بەرهەم موڵکی تاکە کەسو دەستەیەک نەبێت، موڵکی هەموو بەرهەمهێنەران بێت، وەک چۆن کۆمەڵ ئیشدەکەن بە کۆمەڵیش بەرهەمەکەی بیخۆن.

ئەمجارە ئاواتی کۆمەڵی بەختیار خەو نەبوو، بیرکردنەوە بوو لە شتێکی ڕاستەقینەی وا کە بێتە دیو بە ڕەنجو خەباتو لەخۆ بووردنو فیداکاریی زەحمەتکێشان خۆیانو هاوبیرانی ئەوان هاتە دی.

ئێستا دادوەری کۆمەڵایەتی لەوە دەرچووە، کە تاکە خەوو بیرکردنەوەو ڕێگەنیشاندان بێت، بەڵکو ڕژێمەو پەیڕەوەو هێنراوەتە دیو زۆر وڵاتانی گرتۆتەوەو بەرەو نەخشەی جیهان دەچێت. هۆی بەرهەمهێنان موڵکی هەمووانە، کارکردن بە کۆمەڵە، بەرهەم خواردن بۆ هەموو کارکەرانو کارگەرانە، ئەگەر سووخۆرو بازرگانە چاوچنۆکەکانی قورەیش مایەی هەژاریی خەڵک بووبن، هەژاری لەگەڵ

کوفرو خوانەناسیدا لەو سەردەمەدا بەرامبەر بە یەک وەستابن، ئەوا سەرمایەداری خوێنمژی ئەم سەردەمە، ملیۆنان، بەڵکو سەدان ملیۆن هەژار دەکاتو لە هەموو کوفرو خوانەناسییەک پیسترو شایانی نەهێشتنو لەناوبردنەو هەر نامێنێتو ئادەمیزادی ئەم سەردەمە کۆمەڵەی بەختیاریی خۆی بنیات دەنێت.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| ئەروم | : | قوەت، هێز |
| دیاردە | : | دیارکردن |
| ڕووت و ڕەجاڵ | : | بێ جلوبەرگ |
| خەوش | : | عەیب |

### گفتوگۆ:

١. بۆچی هەژاری دەبێتە هۆی بێ باوەڕی؟

٢. ئەو ئایەتو فەرموودانەی دەربارەی هەژاری وتراوە چین؟

٣. چ ڕژێمێک هەژاری لەناو دەبات؟

٤. بە چ جۆرێک هەژاری لە وڵاتدا ناهێڵین؟

٥. جیاوازی نێوان ڕژێمی دادوەری کۆمەڵایەتی و سەرمایەداری چییە؟

# ئەز دزانم ئاڤ ل سەر چ را دچت بەلێ نابێژم

مرۆڤەکی ژ کورێ خوە پرسی ئەرێ لاوێ من تە چەند دۆست هەنە؟ کوری گۆت: بابۆ من گەلەک هەنە، بابێ گوت چەندن؟ کوری گۆت: بێ ژمارن.

بابێ گۆت: کورێ من ئەز وەلێ هزر دکم دۆستێن تەیێن بەرویکێنە هندی بەرویکاتە تەژییە دۆستێن تە پرن، بەلێ گاڤا بەرویکا تە ڤالا بوو تۆ بێ دۆستی، چونکی بابێ تە دهەمی ژیێ خوەدا دۆستو نیڤ ژ خوەرا گرتنە تە چاوا کارییە هندە دۆستا بگری؟

دەکا رابە ئیشەڤ چەند دۆستێن تە هەنە بجەربینەو پاشی ئەمێ نیڤ دۆستێ من بجەربینن، کوری گۆت: ل سەر چاڤێن من حەچی دۆستی ئەز بێژمێ کا جانێ خوە بدە من نابێژت نە ما من هندک قەنجیو چاکی ب وانرا کرییە؟!

بابێ گۆت: لاوێ من دۆستێن تەیێن خواردنێنەو پێ گوتیە: (هەڤالێ پاری ناچت هاری) دە رابە ئیشەڤ یەکو یەک هەرە ل دەرێ مالا وان دۆستا بێژە: پاشا وێ من کەرب گرتی بییەوێ من بخەنقینت هەما بەس ئیشەڤ من بحەوینە، کا بەرسڤا وان وێ ببت چی؟

کور رابوو چۆ دۆستێن خوە کت کت سەحکرن، حەچیا چۆ ل دەرێ مالێ گوتێ ئەز رەڤیێ پاشێمە وێ من بخەنقینت بەس ئیشەڤ من بحەوینە، پەرسڤا تەڤا بی یەک گۆتن: ئەڤ بارەک گرانە ئەز نکارم پاشای ژ خوەرە بکم دوژمن کور زڤری هات مال، بابێ گۆت: ها... دۆستێن تە بێن چی؟

کوری گۆت: هەمی وەک گۆتنا تە دەرکەتن، بەس هەڤالێن

بەرویکێنە. بابێ گۆت: دە ڕابە ئەمێ ڤێجا نیڤ دۆستێ من بجەربینن، ڕابووە بەرانەک ئانین سەر ژێکرن و ل ناڤ دار بەستێدا پێچان، بابێ گۆتە کوڕی دە ڕابە هەرە مالا فلان کەسێ- نیڤ دۆستێ بابێ- بێژە بابێ من گۆتیە بلا بگەهیت مالا مە پچەک کارێ وی هەیە، کوڕ ڕابی وی نیڤ شەڤێ چۆ دەرگەهێ نیڤ دۆستێ بابێ خوە قوتا، مێرک ژ خەو ڕابوو هات ل بەر دەرێ‌و ژێ پرسی تە خێر بیت برازا؟!

کوڕی گۆت: مام، بابێ من گۆتیە بلا بگەهیت مالا مە کارەک وی هەیە، دۆستی گۆت: ل سەر چاڤا نهۆ ئەزێ بێم چو جلێن خوە گوهۆڕین‌و بلەز قەستا مالا بابێ کوڕکی کرن، حەتا گهان وێ دێ مێرک پرسیار ژ بابێ کوڕکی کر: تە خێر بت ڤی نیڤ شەڤێ؟! بابێ گۆت: خێرە! ئەڤ دار بەستیا هەیا کوڕێ پاشایە کوڕێ من وێ کوشتی کا ئەم چ‌ژێ ب کین؟

پشتی هزرێن خوە کرین دۆستی گۆت: من ڕێک دیت، ئاشێ گوند سەکنیە ئەمێ ڕابین هەرین جووا ئاشی بکولن تەرمێ خوە تێدا فەشێرین‌و دیسا وەک بەرێ لێ بکین سبەهی ئاشڤان وێ ئاڤێ بەردت سەر ئاشی، کی دزانت کو تشتەک ل بن جووا ئاشیدا هەیە؟ ڕابوون چون وێ نیڤ شەڤێ جۆ کۆلان دار بەستا خوە تێدا بن ئاخکرن‌و جۆ وەکی بەرێ لێکرن‌و هەر یەک ڤەگەڕیا مالا خوە، بابێ ڕۆژا پاشی گۆت کوڕێ خوە: دە ڕابە هەرە دکانا نیڤ دۆستێ من یێ شڤێ دی بێژێ بابێ من گۆتیە: بلا تۆپەک قوماشێ تازەو گران بها ژمن ڕا ڕێکت، کوڕ چۆ تۆپەک قوماشێ وەک بابێ وی گۆتی ئانی، باب ڕابوو ئەو تۆپێ قوماشی زیڤار زیڤار کر خستە ل جوالەکێدا گۆتە کوڕێ خوە دە ڕابە ڤی جوالی ببە ل بەر دەرێ دکانا وی ڤالە بکەو

هنەک جڤینان بدێو بەرێ خوە بدێ کا وی چ بێژت؟ کورِ رابی وەک بابێ گوتی کر، نیڤ دوستی بەرێ خوە دایێو سەری خوە هەژاند گوت: دێ هەرە مام بەنی (ئەز دزانم ئاڤ دسەر چ را دچت بەلێ ئەز نابێژم) کورِ ڤەگەریا مال بابێ گوت: ها... تە چاوا نیڤ دوستێ من دیتو چی ل تە ڤەگەراند؟ کوری گوت: ل من ڤەگەراندو گوت: (ئەز دزانم ئاڤ دسەر چ را دچت بەلێ ئەز نابێژم) بابێ گوت کورێ من تە زانی چ گوت؟ کوری گوت: نە. بابێ گوت: ئەز دزانم ئاڤ دسەر تەرمێ کورێ پاشێ را دچت بەلێ ئەز نابێژم ڤێجا گەرەکە دناڤبەرا دوستاندا هولێ بیت، نەخاسم دوستێ بابێ مروڤی چونکی هاتییە گوتن (دوستاهیا دوستێ خوە بەردە، بەلێ دوستاهیا دوستێ بابێ خوە بەرنەدە).

هەر دەمێ مللەت هەمی پێکڤە ببن دوستو هەڤال بێگومانە وێ خوەشیێو شادی ژ تەڤارە بت. ئەگەر نەهنەک وێ پێ بمرنو هندەک وێ ژێر بمرن.

(مەلا مەحمودێ دیرشەوی، مشتاخا چیا ژ گوتنین پیشیا بەغدا).

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
| --- | --- | --- |
| وەلێ هزر دکەم | : | وا بیر دەکەمەوە، وای بۆ دەچم |
| دۆستێن تەیێن بەروێکینە | : | دۆستەکانی تۆ دۆستی گیرفانن |
| ڤالا بوو | : | بەتاڵ بوو |
| دە ڕابە | : | هەڵسە، هەستە |
| ئیشەڤ | : | ئەمشەو |
| پاشا ل من کەرب گرتی بییە | : | پاشا لە من توورە بووە |
| بخەنتقینیت | : | بخنکێنیت |
| کت کت | : | یەک یەک |
| ڕەڤیێ پاشیمە | : | هەڵاتووی دەستی پاشام |
| بەرسڤ تەڤا | : | وەڵامی هەمووان |
| سەر ژێ کرن | : | سەری بڕی |
| چژێ بکین | : | چی لێ بکەین |
| من ڕێک دیت | : | ڕێگایەکم دیتەوە |
| زیڤار زیڤار کر | : | پارچە پارچە کرد |
| نەخاسم | : | بەتایبەتی |
| ژتەڤارەبت | : | بۆ هەمووان دەبێت |

# ژیانی کۆچەر

لەگەڵ ئەوەشدا کە مرۆڤ ژیانی کۆمەڵایەتی گۆڕاو بەرەو پێشەوە هەنگاوی ناو، ژیانی ئابوریشی بەرەو کشتوکاڵو تا ڕادەیەک پیشەسازییەوە ڕۆیشت، کەچی ژیانی ئاژەڵداریو بەخێوکردنو لەوەڕاندنی واز لێنەهێنا، ئەمە بۆ ماوەیەک مایەوەو تەنانەت لەناو دێهاتو ئاوەدانییەکانیشدا، تا ئێستا ژیانی ئاژەڵو مالات بەخێوکردن ماوە، دوای ئەوەی، کە بە تەواوی شۆڕشی پیشەسازی هەموو لایەکی جیهانی گرتەوەو کاروباری کۆمەڵایەتیش لەگەڵیدا گۆڕاو،

تەنانەت کشتوکاڵیش جۆرێکی تری لێهاتو بەرەو پێشکەوتنو مەکینە بەکارهێنان ڕۆیشت، لە زۆر لاداو ئاژەڵ بەخێوکردنیش بارێکی نوێی گرت، لەگەڵ ئەمانەشدا لە هەندێ شوێنی جیهاندا بەتایبەتی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا، ژیانی ئاژەڵداریو مالات بەخێوکردن بە شێوەی کۆنی مایەوە، لەبەر ئەوە دەبینین ئەوانەی خەریکی ئەمەن، ژیانی کۆچەریو کۆچەرایەتی خۆیانیان واز لێنەهێنا، لەبەر ئەوە دەبینین لە زۆر شوێنی ولاتەکەماندا لە عیراقدا بە گشتیو لە کوردستاندا بەتایبەتی، ئەو ژیانە، تا ئێستا باوەو هەیە، ئەویش بریتییە لەوەی، کە خێڵەکان بە یەکەوە لە شوێنێکی تایبەتیدا، کە نزیکی ئاوو لەوەڕگە هەڵدەدەنو لەژێر ڕەشماڵدا، کە لەبەنی موو دروستدەکرێت دەژینو ئاژەڵو مالاتەکانیان لەو شوێنەدا بەخێو دەکەنو دەی لەوەڕێنن، ئەمەش بەپێی وەرزە، لە زستاندا دێنەوە بۆ پێ دەشتەکانو لە هاویندا بەرەو ژوور دەبنەوە بۆ کوێستانەکان بە دوای لەوەڕدا.

ئەوەی شایانی باسە کۆچی هۆزە کوردەکان چونکە لە

ناوچەیەکی شاخاوی دان، کۆچی (ستوونیە)ی یە لە خوارەوە بۆ سەرەوە، بەڵام کۆچی ئەو هۆزانەی لە دەشتو بیاباندا دەژین جوڵەو کۆچیان (بازنەییە)بە واتای بۆ لەوەڕ بە دەوری خۆیاندایە دەسوڕێنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ژیانی کۆچەریو هاتوچۆیان بێ ناخۆشیو بێ ئەرکو ماندوبوون نییە، بەڵام ئەگەر ساڵ خۆش بێتو بەهارەکەی تەڕ بێتو هاتیی بێت هەموو ناخۆشییەکیان لەبیر دەچێتەوە هۆزە کۆچەرەکان بە زۆری لەسەر بەروبوومی ئاژەڵو ماڵاتەکانیان دەژین.

ئەگەر چی هەندێکیان لە کاتی زستاندا، کە دێنەوە پێ دەشتەکان لە ناو دێهاتدا بن یان هەر لەژێر ڕەشماڵدا کشتوکاڵێکی کەم دەکەن بەدەم کاروباری تریانەوە، ئەم هۆزانە ئاژەڵەکانیان بە زۆری مەڕو بزنەو کەمێک ڕەشەووڵاخیشیان هەیە، ماڵو کەلوپەلیان سوکەو بە وڵاخو کەر دەیگوێزنەوە. بە دەم لەوەڕەوە لە سەرەتای بەهاردا بەرەو کوێستانانەکان بەرەو ژوور دەبنەوەو ئاژەڵەکانیان لەو کوێستانانە دەلەوەڕێننو تێریان دەکەنو لە دەمە دەمی پایزدا بەرەو خوار، بەرەو گەرمیان دبنەوە بەو هەموو پیتو بەرەکەتەی کە لە ماڵاتەکانیان دەستیانکەوتووە، لە کەرەو ڕۆنو پەنیرو، خوریو موو، ئەگەرچی ژیانی کۆچەریو کۆچەرایەتی بەرەو کەم بووینەوەو زۆربەی هۆزەکانی نیشتەجێبوون یان خەریکە نیشتەجێ دەبن بەڵام هێشتا بەشێکی کەم ماون وەکو هەندێ تیرەی جاف.

ئەوەی شایانی باسە لەم دواییەدا میریو کاربەدەستان خەریکی نیشتەجێکردنی ئەو هۆزو تیرانەن، کە هێشتا بەشێوەی کۆچەری ماونەتەوە، بەتایبەتی هۆزە عەرەبەکانی ناوچەی ناوەڕاستو

ڕۆژئاوای وڵات، ئەویش بە دروستکردنی خانوو قوتابخانەو بیمارستانو هەڵکەندنی بیری ئاوو ڕێکخستنی ڕێو شوێنی کشتوکاڵ.

باری کۆمەڵایەتی ناو هۆزە کۆچەرەکان بەپێی باری ژیانیان لەسەر بنەڕەتی هۆزایەتییە، ئەویش ئەوەیە کە هەموو یەکێک بە هۆی هۆزەکەیەوە دەپارێزێت، بە واتا هەموویان یەکن بۆ پارێزگاری خۆیانو مەڕو ماڵاتیان، جگە لەوەی، کە هەر هۆزە سەرۆکێکی هەیە کە ئەویش پشتاو پشت بۆی ماوەتەوە، جگە لەوەی، کە هەر ئازاییو زرنگی دەورێکی هەیە لە بۆ ئەو سەرۆکەو سەرۆکی هۆز دەستەڵاتێکی تەواوی هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری هۆزەکەیدا لە هەموو ڕوویەکەوە، جگە لەوەی، کە ئەنجومەنێکی تایبەتی لە پیاو ماقوڵانو ڕیش چەرمووی هۆزەکە یارمەتی دەدا لە ئیشو کاری هۆزەکەدا، بەڕێ پیشاندانو پێشکەشکردنی ئامۆژگاری.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| ئابوری | : | (اقتصادی) |
| ئاژەڵوماڵات | : | حەیواناتی مالی لەمەڕو بزنو ڕەشە وڵاخ |
| ڕەشماڵ | : | ئەو خانووە سەفەرییەیە کە لە بەنی مو دروستدەکرێت کۆچەر تییدا دەژیت وەکو (چادر)و (خێمە) |
| نیشتەجێکردن | : | دامەزراندنو دانانی کۆچەریەکان لەناو دێهاتو ئاواییدا |

## گفتوگۆ:

١. هۆزی کۆچەر لە هاویندا لە کوێ هەڵدەدا؟

٢. کۆچەرەکان بە چی دەژین؟

٣. ئایا ڕاستە کە خەریکە ژیانی کۆچەرایەتی نەمینێت؟

٤. ناوی ئەو هۆزانە بلێ، کە تا ئێستا لە کوردستاندا خەریکی کۆچن؟

٥. وەسفی دیمەنی ڕەشماڵێکی ماڵە کوردێک بکە لە تەڕی بەهاردا لە قەد شاخێکدا هەڵیداوە؟

## قازی محەمەدی پێشەوا و کۆماری کوردستان

قازی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی میرزا قاسمە، لە ساڵی (١٩٠١)ز لە شاری مهاباد (ساباڵخ) لە بنەماڵەیەکی ئایینی بەناوبانگ لەدایکبووە، هەموو زانستە ئایینییەکانی سەردەمی خۆی تەواو کردووەو زۆر کتێبی بێگانەی خوێندۆتەوە، جگە لە زمانی فارسی (ڕوسیو ئینگلیزیو عەرەبی) بە نووسینو خوێندنەوە زانیوە.

یەکەم جار، کە قوتابخانە کراوەتەوە، قازی محەمەد کراوە بە سەرۆکی (اداره المعارف)ی ناوچەکە، بێ ئەوەی یارمەتیو موچە لە میری وەربگرێت، هەمیشە خەڵکی هانداوە بۆ خوێندنو خوێندەواری، پاڵپشتی هەژارو جوتیارو ڕەنجدەران بوو، هەستی نیشتمانپەرەوەریو دیموکراسیخوازی کاری لە بیروباوەڕو ڕێبازی ژیانی کردووە.

ساڵی (١٩٣٨)ز قازی عەلی باوکی کۆچی دوایی دەکات، قازی محەمەد دەبێتە قازی مهاباد، لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانیدا (١٩٣٩- ١٩٤٥)ز دەوڵەتی شاهەنشاهی لە ئێران بێهێز دەبێت، دەسەڵاتی بەسەر زۆر ناوچەی حوکمڕانی خۆیدا لە دەستدەدات، هەر لەو ساڵانەدا هێزی سوپای یەکێتی سۆڤیەت بەشێک لە خاکی ئێران داگیردەکات، ئەم بارودۆخە لەلایەکو گەشەکردنو بەرزبوونەوەی هەستی کوردایەتی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا لەلایەکی ترەوە، بوو بە هۆی ئەوەی ڕێکخراوێکی نیشتمانی ڕزگاریخواز بە ناوی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان) (ژ.ک) ساڵی (١٩٤٢) لە مهاباد دابمەزرێنرێت، ئەم کۆمەڵەیە گۆڤاری (نیشتمان) یان کردە زمانحاڵی خۆیان، لەو سەردەمەدا گۆڤاری (نیشتمان) ڕۆڵی گرنگی بینی لە هۆشیارکردنەوەی خەڵکی ناوچەکەو ئاراستەکردنیان بۆ کاری ڕێکخراوەییو نیشتمانی.

هەر کۆمەڵەی (ژ.ک) بووە هۆی دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە ساڵی(١٩٤٥). لە (٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦)دا کۆماری کوردستان لە مهاباد دامەزراو قازی محەمەد بووە سەرۆکی کۆمارو لەگەڵ سرودی (ئەی ڕەقیب) لە مەیدانی چوارچرا (ئاڵای کوردستان) هەڵکرا، پاش چەند ڕۆژێک دەستەی وەزیران لە سیازدە کەس دیارکران.

ئەگەر چی کۆماری مهاباد یازدە مانگ لە تەمەنی پڕ شانازی بەسەربرد، بەڵام لەو ماوە کورتەدا ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کۆماری کوردستان لە ڕووی ئابوریو کۆمەڵایەتییەوە گەشەیکرد، بایەخی زۆر بەزمانو ئەدەبی کوردی دراو ژمارەیەک ڕۆژنامەو گۆڤاری بە توانا دەرچوونو بوونە ناوی دیار لە کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردیدا، لەوانە: (ڕۆژنامەی کوردستان، گۆڤاری ئاوات، گۆڤاری هەڵاڵە، گۆڤاری هاواری نیشتمان، گۆڤاری گڕوگاڵی منداڵانی کورد)، هەروەها هێزی سوپای کۆمار دامەزرا، بزوتنەوەی شانۆگەری چالاکی بەخۆوە بینی، شانۆی (دایکی نیشتمان) نمایشکرا.

دوای یازدە مانگ بەهۆی گۆڕانی بارودۆخی سیاسی جیهانو ناوچەکەو کشانەوەی سوپای سۆڤیەت لە ناوچەکەو نەبوونی کادری ئیداریو پسپۆری شارەزا بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی کۆمارەکە، هەروەها نا بەرابەری سوپای ئێرانو هێزی کۆمار، بوونە مایەی لاوازبوونو شکستی کۆماری کوردستان لە بەرامبەر لەشکری ئێراندا، بەم جۆرە بە پیلانێکی دەرەکیو ناوەکی نەخشە کێشراو، قازی محەمەدو هاوڕێکانی ناچارکران خۆیان بدەن بە دەست لەشکری دوژمنەوە، دوژمن زۆر دڕندانە، وەک پیشەی هەمیشەییان لە ڕۆژی

(١٩٤٧/٣/٣١) دا لە مەیدانی چوارچرادا، قازی محەمەدو حسین سەیفی قازیو ژمارەیەک لە قارەمانو شۆڕشگێڕانی کوردیان لەسێدارە دا.

پێشەوا قازی محەمەد نەیویست لە ناخۆشیو شکستدا ئەو میللەتە جێ بهێڵێت، کە لە خۆشیو دامەزراندنی کۆماردا لەگەڵیان بوو، لەبەر ئەوە زۆر جەسورانە چووە پێشوازی مەرگو بووە ناوێکی نەمرو سەرکردەیەکی هەڵکەوتووە لە مێژووی هاوچەرخی کورد.

شاعیرو نووسەری ناسراو ئیبراهیم ئەحمەد (بلە) لە ماتەمی لە سێدارەدانی پێشەوادا دەڵێ:

**گەرچی شیوەنە شینی پێشەوا**
**گریان نەنگییە لە شینی ئەوا**
**بێخی ناکۆکیو نیفاق هەڵکەندن**
**ڕێگەو شوێن دانان بۆ تۆڵە سەندن**
**یەکگرتن، جەنگین، نەبەرد، تا مردن**
**هەوڵو تەقەلای گەل، ئازادکردن**
**گیانی بڵندی سەرۆک ئەکەن شاد**
**ئەیگەیەننە بەهەشتی موراد**

### بۆ زانین:

شانۆی (دایکی نیشتمان) لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا نمایشکرا، ناوبانگی دەرکردو لە شوێنە دوورەکانی کوردستانەوە خەڵک بۆ تەماشاکردنی دەچوونە مهابادو نەخشێکی بەرچاوی هەبوو لە هۆشیارکردنەوەو جۆشدانی هەستی نەتەوایەتی لەنێو خەڵکدا، بەتایبەتی لەنێو لاوانی نەتەوەکەماندا.

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| میری | : | دەوڵەت |
| موچە | : | مەعاش، بژێوی |
| نابەرابەر | : | نا یەکسان |
| اداره المعارف | : | بەڕێوەبەرێتی گشتی پەروەردە |
| بێخی ناکۆکی | : | سەرچاوەی ناکۆکی |
| نیفاق هەڵکەندن | : | لە گۆڕانی دووبەرەکیو دووزمانی |
| نمایشکرا | : | پیشاندرا |
| نەخشێکی بەرچاو | : | کارێکی دیار |

# ژیانی ئەمڕۆم دەفرۆشم بۆ کڕینی نانی سبەی

لێرە بە هێمنی هەنگاو بنێ هاکا دیسان دەنگی تەقینەوەی مین لەنێو ئەشکەوتی ئەو شاخانەدا دەنگی دایەوەو، پرمەی ولاغی قاچاخچیو هانکە هانکی کۆڵبەرانی ماندووی بڕی، ئەرێ ئەو کۆڵبەبەرانەی وا ژیانیان بۆتە چیرۆکی کارەساتو هەڵپڕووکان قاچاخچین؟ نا ئەوانە قاچاخچی نین، کاسبکارن لە گەرووی شێردا بە شوێن پاروووە نانێکدا دەگەڕێن، بە جەرگترین مرۆڤەکانی ئەم گۆی زەوییەن، کە سینگیان پڕە لە چیرۆکی کارەساتو سات بەساتی ژیانیان ململانێی مەرگەو ژیان. هەر یەک لەوان باری هەزاران خەمو کارەساتیان لە کۆڵناوەو قوربانییەکن بە تاوانی ژیان، ئایەتی مەرگیان دەپژێننە کۆشی مانو هەناسەیان، چ ڕاتلەکێنەرو خەمهێنەرە، تەنانەت ڕوانینو ووردبوونەوەیەکی کورت لە بەشێکی زۆر بچوک لە شەوەژانو ئازارەکانیان.

ئەوان قاچاخچی نین، بەڵام بێکاروکاسبینو ڕژێمی ئێرانی دوژمنیان سوێندخواردوو نەیاری قەستەسەریان، ئەو ناوەی بەسەردابڕیون تا هەروا سوکو سانا هەموو جۆرە تۆمەتێکیان بخاتە پاڵو دەستی ئاوەلا بێ بۆ هەموو جۆرە سەرکوتێکو هەر چەشنە ڕمکردنیان. لە بیرمان نەچێ ئەو (قاچاخچی)یانە بەشێکی زۆر لە ئەو (ڕەسەنترین) نەتەوەی ئێرانیو (بوێرترین سنوور پارێزانی ) ولاتن کە گەورە بەرپرسانی ڕێژیم وەختو ناوەختو لە کاتە ناسکەکاندا بەسەریاندا هەڵدەڵێن، کەچی ئەوان بە کولە مەرگی دەژینو ژیانیان وە مەترسی دەخەن بۆ ئەوەی پاروووە نانێک بۆماڵو منداڵیان وە دەستبێنن. ئەوان لە ناوچەکەیدا دەژین، کە بە وتەی پایە بەرزانی ڕژێم (لە هێمنترینو ئارامترین) ناوچەکانی ولاتە، کەچی کارو کاسبیو

کارگـەو پیشەسـازیو ئاوەدانـی تیـا قاتـە.

ژیـان لەناوچـە سـنوورییەکانی کوردسـتاندا گەلێک تاقـەت پڕوکێـنو پـڕ هەژمەتتـرە لـە چـاو ناوچەکانـی تـری کوردسـتان. ئـەو ناوچانە هەموو کاتو زیاتر لە شـوێنەکانی تری کوردستان سـوتەمەنیی شـەڕو پێکـدادان بـوون، زەوییەکانیـان لەجێـی لـە خۆگرتنـی دەغـڵو دان، بوونەتـە کێڵگەمیـنو هـەر بـە ڕووی دانیشـتوانی ناوچەکەشـدا تەقیونەتـەوەو دەتەقێنـەوە.

لەنێـوان شـەڕی ئێـرانو عێـراق زۆرتریـن زیانیـان بەرکـەوتو لەسـەردەمی بـە نـاو ئاوەدانـیو (سـازندەگی) دا کەمتریـن ئاوڕیـان لێدرایـەوەو ئێسـتاکەش زۆرتریـن قوربانیانـی کارەسـاتەکانی پاشـماوەی شـەڕو درێـژەی سیاسـەتە چەوتەکانـی ڕێژیـم هـەر لـەو گەلـەن. گەلێک کـە تەنانـەت ژیانـی کۆڵبـەریو شـەو بـە کێویشـی پـێ ڕەوا نابینیـن. رامـان لـە ژیانـی کولـە مەرگـیو پڕاوپڕ لـە دۆخـی لـە گێرانـەوە نەهاتووی ئـەم خەڵکـە، ویژدانیزینـدووی هـەر مرۆڤێکـی دەروەسـت بـە مرۆڤایەتـی دەهەژێنێ.

ئـەوان دەزانـن تەقەیـان لێدەکـرێو دەکەونـە بـەر دەسـرێژی هێزەکانـی ڕێژیـم، ئـەوان دەزانـن مینـە نووسـتووەکانی ژێـر دڵـی خـاک، چاوەڕوانیـان دەکـەنو هـاکا گرمەیـەکو پەڕینـی دەسـتو لاقێـک، لـە لێـدان کەوتنـی دڵێـکو هەتیووبوونـی منـاڵێکی چـاو لـە دەرگـاو بـێ سەرپەرشـتو بـێ نانهێنـەر مانـەوەی بنەماڵەیـەکو... ئـەوان بـاش دەزانـن سـەرماو سـۆڵو بەفرو کرێـوە بـێ بەزییـە، لەوانەیـە برشـتیان لێببـڕێو ڕقیـان هەڵێنـێ یاخـۆ بکەونـە ژێـر ڕنـوی بەفـرو لەوانەشـە بەرگـەی رەوەزو هەڵدێـران نەگـرنو بکەونـە بـەر رقـی سروشـت، بـەڵام نیـازی کۆشـێک منـاڵـی برسـی چـاوەڕوان، نەبوونـی هیـچ هیوایـەک بـۆ

دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان تین وەبەر هەنگاوەکانیان دەنێو وا دەکا بیر لە گرفتو کۆسپو کۆستەکانی بەردەم رێیان نەکەنەوە. ئەوان رێگەی هاتو نەهاتیان دەگرن، کەچی لەولا دڵە خورپە بۆ ساتێکیش لە بنەماڵەکانیان نابێتەوە، کە ئاخۆ بڵێی کاسبکارەکانیان، برا، باوک یا هاوسەرەکانیان جارێکی تر سەر بەدەرگای ماڵیدا بکەنەوەو بۆ نوچدانێ لای وان بمێننەوە.

لە راستیدا نە ئەوان قاچاخچینو نە ئەو کەلوپەلانەی لەسەریان دەدرێنە بەر دەسرێژ، شتومەکی قاچاخنو نەکردەوە نا مرۆڤەکانی هێزەکانی رێژیم لەو پێوەندییەدا پاساو هەڵدەگرن. ئەگەر هێنانو بردنی کەلوپەلو پێداویستیەکانی رۆژانەی ژیان قاچاخە، بۆ لەسەر سنورو لە خاڵی (سیفر)ی سنوردا پێشیان پێناگیرێو بۆ لە قولایی خاکی کوردستاندا دەکەونە بەر راوەدوونانی هێزەکانی رێژیمو چۆنە وا بە سوکو سانا سیلەیان لێدەگیرێو خەڵتانی خوێن دەکرێنو کەلوپەلو شتومەکەکانیشیان بە تالان دەبردرێن. کام یاساو رێسای مرۆڤانەو کامە شەرع رێگە دەدا، کە کاسبکارانی کورد بەبێ هیچ لێپرسینەوەیەک بدرێنە بەر دەسرێژی گوللەو ماڵو ژیانیان لێتێکبدرێ؟ ئەگەر ساتو سەوداو هێنانو بردنی کەلوپەلی ژیانو خواردنو کۆڵبەری قاچاخ تاوانە، کامە یاسا رێگە دەدا بەبێ گرتنو دادگاییکردن سزایەکی وەها توندو نامرۆڤانەیان بەسەردا بسەپێندرێو بکوژانو بریاردەرانی ئەو کارەساتانەش دەسخۆشییان لێبکرێو رێزیان لێبگیردرێ؟

ئەو جۆرە کردەوانەی رێژیم ئەو راستییە ئاشکرا دەکەنو دەیسەلمێنن، کە روانگە ئەوانەوە رۆڵەکانی کورد هەر هەموو بەهۆی کوردبوونیان تاوانبارو نەیارنو کوشتنو دەستگرتنو بەسەر خوێنو ماڵو سامانیان شتێکی ئاسایی، حەلاڵو رەوایە. ئەو رێگە

پێدانەش لە سەرچاوە ئایینییەکانی ڕێژیمو ئایدۆلۆژیی باڵا دەستەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەگینا هەر لەو پێوەنییەدا ڕوونو ئاشکرایە، کە خودی بەرپرسانی پایە بەرزی ڕێژیمو بگرە بڕیار بەدەستانی ئاستی خوارەوەش بە کەڵک وەرگرتن لە ڕانتو ڕانتخۆریی نێو خۆی دەزگای دەوڵەتییەکان بە کەڵک ئاوەژوو لە پێوەندیو بەرپرسیارەتییەکانیان بە شێوەیەکی بەربڵاوو لە پانتایەکی بەرفراواندا هەر ئەو شتومەکە قاچاخەو کەلوپەلی بەمانا ڕاستی قاچاخ لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستان بۆ قوڵایی شارەکانی ئێرانو هەموو ناوچەکانی وڵات ڕادەگوێزن.

باس لە چارە ڕەشیو بێ ئەنوایی ئەو گەلە بەشخوراوە نە ئەوەیە تەواو دەربڕی مەزڵوومییەتو چەوساوەیی ئەوان بێو نە ئەوەیە کە بەو چەند دێرە ببڕێتەوە.

ئەوەی جێ بەهەموو دڵخۆشییەکو ژیانی خێزانیان لێژ دەکاو بەرەو چارەنووسی لێڵو نادیاریان دەبا، بێگومان بێ هیوایی، دۆشداماوەیو بێ دەرەتانییە، ئەگینا بڵێی ئەو کاسبکارانە ئەگەر تۆسقاڵێ هیواو شک ببەن، کە لە پەنا کەسوکارو خێزانیانو لە شار یا گوندەکانیان کارێکو سەرقاڵییەک هەبێ، کە بتوانن ژیانیانی پێ دابینبکەن، بێنو بە لە بەرچاوگرتنی هەموو ئەو مەترسیانەو هەست پێکردنو بە مۆتەکەی مەرگ بەسەر سەریاندا ملی ڕێگەی هاتو نەهات بگرن؟

ئەوان بە تاوانی قاچاخچییەتی گیانیان لێدەستێندرێو بارەکانیان زەوتو بە تالان دەبردرێ لە حالێکدا زۆربەی ئەو کەسانەی لەو چارەنووسەدا پەلەقاژەی مەرگو ژیانیانە، کرێگرتە یاخۆ کۆڵبەرنو بارەکەش هی خۆیان نییەو ئەگەر لە کەمینو مەرگیش پارێزراو بووبن،

ئەوا دەبێ لە بەرامبەر دانی سزای قورسی ( تا ٢٥٠ هەزار تمەن) بگەڕێنەوە سەر کاروباری خۆیان! ئەوە لە حاڵێکدایە، کە قازانجی ئەو کۆڵبەرییە لە ڕۆژدا لە (٥٠٠٠) هەزار تمەن بۆ سەری تێناپەڕێ. ملدانی ئەوان بەو چارەنووسەش لەو دۆخەدا کە بێکاری، گرانیو، ڕۆژ ڕەشی لە هەموو بارێکەوە تەنگی بە خەڵکی کوردستان هەڵچنیوە.

ئەوان لە پڕووکانی لەشو گیانیان خۆش دەبنو بەرەو ڕووی ئەو هەموو مەترسیو کارەساتانە دەبنەوە، تەنیا لە پێناو دەستخستنی لانی کەمی بژێوی ژیانیانو ئەوەش دیاریو ویستی ئەو ڕێژیمەیە، کە تینووە بە خوێنی ڕۆڵەکانی ئەو گەلەو لە ڕێزی دوژمنە سوێند خواردووەکانیەتی.

لە ڕاستیدا ئەوە گۆشەیەکە لە پێناسەی نەتەوەیەک، کە لە چوارچێوەی ئێرانێکی دژ بە هەموو مافەکانیو نامۆ بە هەموو داوا ڕەواکانی ناچار بە ژیانێکی کولەمەرگی کراوە. هەر لە جێدا هۆی سەرهەڵدانی هەژاری، بێکاریو گەشەسەندنیان لە کۆمەڵگەی کوردستانداو پەنابردنی دانیشتوانی ئەم هەرێمە بۆ هەر چەشنە کارێکی تاقەت پڕوکێنو پڕ مەترسی دەگەڕێتەوە سەر دواکەوتوو ڕاگیراوی گەشەنەکردنی کوردستان، بەڵام هەر هۆی گەشەنەسەندنی کوردستان چ لە بواری ئابوریو چ لە بواری سیاسیو کۆمەڵایەتیدا گرێدراوە بە نێوەڕۆکی سیاسەتە شۆڤینانەو دژە کوردانەی دەسەڵات بە دەستانی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی.

ڕژێمی کۆماری ئیسلامی بە سەرنجدان بەوەی، کە هەر لە سەرەتاوە بزووتنەوەی مافخوازانەی گەلی کوردو خەباتگێڕانی کوردستانی، وەک چقڵی چاوو لەمپەری جێبەجێکردنی سیاسەتە دژی گەلییەکانی زانیوەو لە ڕوویەکی تریشەوە بەهۆی بیری شۆڤینیانەو

بە بیانووی پڕوپوچی، وەک نەبوونی ئەمنییەتو هەبوونی ڕەوتی ئازادیخوازی (هەڵبەت لە ڕوانگەی ئەوانەوە جوداییخوازی) کوردستان، نیشتمانی ئێمەیان لە هەژاریو دواکەوتوویدا ڕاگرتووەو هەوڵی سڕینەوەی شوناسی نەتەوەییو مێژووییمانی داوەو هەر کاتێکیش مەترسییەک بەرەو ڕووی دەسەڵاتەکەیان بۆتەوە، کردویانین بە قەڵغانی بەڵاو نازناوی (ڕەسەنترین ئێرانی)و بوێرترین (سنوورپارێزی) داوەتە پاڵیان.

سڕینەوەی ئاسەواری هەژاری، بێکاریو دواکەوتوویی کوردستان یە گشتیو ناوچە سنوورییەکانی کوردستان بەر لە هەموو شتێک بەستراوەتەوە بەخۆشکردنی بواری گەشەی سیاسیو ئەوجار گۆڕینی ڕوانگەی ڕێژیم سەبارەت بە کێشەی نەتەوەیی لە کوردستانو بەدوای ئەوەدا دانانی پلانی کارامەو لەبار لە بواری سەرمایەگوزاری، دامەزردانی کارخانەو کارگە پیشەییەکانو پشتگیرییەکان لە ناوەندەکانی بەرهەمهێنەری دەرفەتی کارو بەشی خسووسیو تەرخانکردنی بۆدجە بە مەبەستی نۆژنکردنەوەو مۆدێرنیزەکردنی کشتوکاڵ، ئاژەڵداریو بەشەکانی تری گەشەی ئابوری، ئەوەش نە لە ئیرادەی دەسەڵات بەدەستانی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی دەوشێتەوەو نە ئەو بیرە شۆڤینانەو دژی گەلییە لە خۆیدا توانای نوێبوونەوەو بەخۆدا چوونەوە شکدەبا.

(عەلی بداغی، ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە (٤٠٠)ە نوا ٢٠٠٤)

## واتای پەیڤەکان

| وشە | | واتاکەی |
|---|---|---|
| دەروەست | : | خەمخۆر |
| ڕەوەز | : | قەدپاڵی شاخ |
| پاساو | : | دەلیل، بیانوو |
| بێ ئەنوا | : | بێ دەسەڵات، چارە ڕەش |
| ڕێژێم | : | ڕژێم |
| ئاوەڵا | : | کراوە، ڤەکری |
| قەستەری سەر | : | تینووی سەر |
| کاسبکار گەلێکن | : | کاسبکارێکی زۆرن، گەلەک شولکەر |
| تیاقاتە | : | لێی نییە، لێ نینە |
| هەژمەت | : | زەحمەت |
| بڕست | : | تاودان، هێز |
| نووچدان | : | کەوتن، کەفتن |

## [ پێرست]